# بەیان

گۆڤارێکی مانگانەی ئەدەبی‌یە

سەرەکی ئەنجومەنی کارگێری
وسەرنووسەر

مصلح جەلالی



● تۆماری جەنگ:
- هەڵوێستی ئەدیبانمان ................ مصلح جەلالی 1
- 28/ی نیسان ............ شفیق محمود حسن 2
- 7/ی نیسان ...................... فؤاد حسین 8
- فرمێسکێ بۆ کوردستانی ئێران .......... نوری علی امین 11
● لێکۆڵینەوە:
- برگوزارم بۆ کوڕانم ............ غەفوری میرزا کەریم 14
- گەڕانەوەیەك ...................... اسماعیل رسول 18
- پرۆژەی دیوانی سەیفی ............ محمود زامدار 22
● رەخنە:
- حمە ئاغای دەربەند فەقەرە ........... مصطفیٰ نەریمان 35
- رەخنەگرە دیموکراسی‌یەکان ........... نەوزاد احمد اسود 38
● چیرۆك:
- پیاوێکی بەڕێز ................ کمال رؤوف محمد 50
- وەسیەتا بابی .................... حکیم عبدالله 54
● شیعر:
- یەکبوون ...................... مدحت بێخەو 56
- گڵپەی خۆشەویستی ............... نەوزاد علی 58
- پەند .................. علی ابراهیم درویش 59
- ئاسمان ............... عبدالخالق سەرسام 60
- خازگینی .................... حکمت جمعة 61
● رۆشنبیری گشتی:
- پیرۆز بە 75 ساڵیا ............. د. حسین رەهبەر 62
● فۆلکلۆر:
- سلاڤ ل تە ................. شکور مصطفیٰ 64
- ژ سترانیت داوەتێت ............ یاسین زیباری 68
● کتیبێ بەیان ................ حسین احمد جاف 70
● شانۆ:
- سیناریوی دووکەس (2) ........ و. احمد محمد اسماعیل 72
● یانەی بەیان ........................ 87
● راپۆرتی رۆشنبیری بەیان .................. 88
● دوا وشە ............... عبدالوهاب تاڵەبانی

دەزگای رۆشنبیری وبلاوکردنەوەی کوردی
.مەیدانی خەلانی - بەغدا -
ت 8875795 (5) خەت

بەرگی یەکەم: سەرۆکی فەرماندە لەگەڵ منداڵانی هەولێردا
بەرگی دووەم: ئاکرێ.

مصلح جەلالی.

# هەڵوێستی ئەدیبانمان وباری ئێستا

ویژەو هونەرو رۆشنبیریو شارستانیەت هەر وەك هەندێ کەس بیریان لێ ئەکەنەوە تەنیا تێگەیشتنێکی رووت نین بەرامبەر بەخەڵکی. چونکە ئەوانە رێبازو بنەڕەت و کردارمان لە کاتێکی تایبەتی خۆیاندا دەستنیشان ئەکەن. ئەبێ بەو جۆرەی تێ بگەین کە ئەمانە ئەو بارە دەروونی یەی کۆمەڵن کە مرۆڤ بەرەو پێش یان بەرەو دوا بەگوێرەی دینامیکی شارستانیەت ئەبەن.

کە واتە ئەدیب هیچ کاتێ ئەگەر دەربڕی ناخۆشی (معانات)و ئازارو ستەم بێت لە واقیعەکەی خۆی جیا نابێتەوە.

ئەگەر یەکێك بیەوێت ئەوەش بکاتەوە کەوا بەو ناخۆشی یەی کە ئەیچێژێ ئەیەوێ خۆشی بکرێ.. ئەبێ مندالّ لێرەدا چی بکات؟ بەواتە ئەدیب ئەگەر ناخۆشی نەچێژی ـ نابێتە ئەدیب.. بەلاّم بۆ بەختیاری خۆی ئەبێت بەشداری یەکی سەرەکی داواکردنی مافی گەلەکەی بکات.. لەم کاتەدا ئەدیبەکانی عیراق بەتایبەتی ئەدیبی گەلی کوردمان دەوری چی بێت؟ کە عیراقی پێشکەوتنخوازو سۆشیالیست لەلایەن خۆفرۆش و ریش پانەکانی قوم و تاران پاشماوەکانی هۆلاکۆو جەنگیزخان ـ هێرشی درندانەیان ئەبەنە سەر شارو دێهات و ئەیان سوتێنن.. ئایا لەم رووەوە کە واقعێکەو هەیە دوژمن خەریکی وێران کردن و داگیرکردنی نیشتمانی عیراقمانەو گەشەسەندنی رۆڵەکانی عیراقی خستۆتە مەترسیەوە توانیویانە بەتەواوی دەوری خۆیان ببینن؟

گومانی تێدانیە کە ئەتوانم بڵێم هەندێ ئەدیبمان کەم تەرخەمیان لەم مەیدانەدا کردووەو بە ئەرکی سەرشانی خۆیان کە واقیعی کۆمەڵگەی عیراقی ولاّتەکەمانە هەڵنەستاون.

بەلاّم دووبارە ئەپرسینەوە کە وا ئەو شەرەی بەسەر عیراقی بالاّوهاوولاّتی یە سەربەست و پەرەسەندووەکانی پێشکەوتووەکانی عیراقدا سەپێنراوە وا لەپێنج سالّ نزیك ئەبێتەوە.. ئایا ئەدیبێك ئەم واقیعە ئاشکراو دیارە هەستی نەجولاّندبێ و هەرەشەکردن لە داگیرکردنی ولاّتەکەی و ژێر دەستەکردنی گەلەکەی جۆشی پێ پەیدانەکردبێ و هانی بەرگرییان نەدابێ ئەبێ کەی هوشیان بجولێت و بە چ ناوێکەوە بەرگری لە خۆیان و خێزان و گەل و کۆمەڵگەکەیان بکەن و بنووسن؟.

ئەبێ ئەو ئەدیبە نووسینەکانی ناوبنێ چی؟ کە رۆڵە دلسۆزەکانی گەلی عیراق باوەریان وابێ و سەرکەوتنەکانی بەرەکانی جەنگمان دەری بخەن کە سەرکەوتن هەمیشە لەژێر سایەی سەرکردەی گەل و نیشتمانی عیراق صدام حسین دا هەر بۆ ئەو عیراقیانەیە کە بەو پەڕی لێبوردن و لێهاتن و تواناوە بەرگری لە بەختیاری گەل و ئازادی پێشکەوتنی وولاّتمان ئەکەن؟.



صدام حسین له بەرگی لادێیدا لەکاتی دەرچونیدا بۆ سوریا.

# ٢٨ نیسانی "١٩٣٧" و له دایك بوونی

## ئەستێرەگەشەی بەختەوەری لە ئاسمانی عێراقدا ...

ئەو وزە و توانایە کە خوا بەتۆی بەخشیوە، هەر بەو وزە و توانـــایـــەوە، تۆی بە فەرمـــانـــدەیێکی ژیـــر و سەرکـــردەیێکی خەبـــاتگێـــر و دلێـــر خولقاند، لە پێناوی چەسپاندن و یەکگرتنی بیر و باوەڕەکانی پارتدا، کە لە ئەنجـامـدا بووە دیـاردەیێکی ئاشکـرا و راستـەقینـە لە ژیاندا. . هەر ئەو وزە و توانایەیە کە شۆڕشی نەتەوە لە بار و دۆخی ناسکیدا پێویستی بووە و کەلە دایك بوونێکی نوێـیــە و دوپـــاتی شنـاسنـامـەی بەخششی شارستانیەتێکەی دەکات. .

**میشێل عفلق**

بەڵێ. . فەرموودەکەی فەرماندەی دامەزرێنەر، بێگومان لە سەرچـــاوەی هەست و بیـــروبـــاوەری دەرونی راستـەقینـەی پێویستی نەتەوەوە هاتوە کە دوپاتی ئەو پێویستی‌یەی کردوە بۆ لە دایـــك بوونی شاسـوارێـك لە پێنـاوی رزگـار کردنی نەتەوە لەژێر چەتری ئەو ئاسمانە رەشە کە نیشتمان و نەتەوە لەژێری‌دا دەژیا لە هەموو روویەکی نالەباری و ئەشکەنجە و ماف‌خوراو و لاوازی و ژێر دەستی بێگانە و بێگانە پەرستیدا.

بێگـومـان . . لـەگەڵ یەکەم سەرەتای چرکە و هەناسەی لەدایـــك بوونی صدام دا، جیهـــانی رێبـــازی بزوتنـــەوەی





صدام حسین لە سالی چلەکاندا

«شفیق محمود حسن»

– وینەی بروانامەی دەرچونی قوتابخانەی ئامادەی (قطر النيل)



شهادة إتمام تدريب

١١٤٠٩١

مقبول

نیشتمانی و عەرەبی سەری بەرزکردەوە و کەوتە جموجۆل بەرەو بووژانەوە و زیندو بوونەوە.. بەرەوگەشەسەندن کە لە پێشاندا بۆ ماوەی چەند سەدەیەك لەژێر باری ژیانێکی تاڵ و نائەمواری و کەساسی و چەوسانەوەدا دەژیا بەدەم ئێش و ئازارەکانیدا لەژێر دەستی بێگانەدا بە ماف خوراوی، دوور بێبەشی لە سامانەکانی نیشتمانی و بەرژەوەندیەکانی دا..

وەنەبێ لە دایك بوونی صدام حسین لەوکاتە نائەمواریەدا کە نیشتمان و نەتەوە تیادا دەژیا بەرێکەوتێکی مێژوویی بناسرێ.. بەڵکوو لەوە قوڵترە کە لەگەڵ رێکەوتی سەرەتای دامەزراندن و لەدایك بوونی پارتی بەعسی عەرەبی سۆشیالستدا هاتووە لە «7» نیسانی 1947.. وەك پێویستێکی نیشتمانی و نەتەوەیی..

ئەوەی شایانی باسە، هەر شانۆ نووسێك لەکاتی ئامادە کردنی شانۆکەیدا، ئەبێ بکەوێتە دوی هەڵبژاردنی پاڵەوانێکی شیاو و لێهاتوو بۆ ئەو شانوگەریە..

لێرەدا نیشتمان و نەتەوەی عەرەبی پاش ئامادەکردنی نووسینی شانوگەریەکەی و چەسپاندنی لە ناخ و دەرونی جەماوەراندا لە نێو بەدیارخستن و روون کردنەوەی مەبەست ئامانجەکانی، لەو کاتەدا لە پەنجاکاندا صدام حسین

لەشۆخی لاویدا بوو کە بەو پەڕی بیروباوەڕیەوە چووە پیری بانگەوازی مێژووەوە بۆ نواندنی پاڵەوانیەتی لەسەر شانۆی گۆڕەپانی خەبات و تێکۆشاندا . .

لە دایک بوونی صدام حسین لە «28» نیسانی «1937»دا - وەنەبێ بە هەڵهەڵە و چەپڵە و دەهۆڵ و زڕناوە پێشوازی کرابێ . . یان لانکەکەی بەگوڵ رازرابێتەوە . . بەڵکو هەمان شێوەی لە دایك بوونی منداڵە هەژارەکان بووە کە بە هەتیوی هاتۆتە کۆڕی ژیانەوە لە ناو جەرگەی جو تیار و چەوساوەکاندا، هەرواش هەمان شێوەی فەرماندە راستەقینەکانی مێژوو پلەبەپلە لە نێو خەبات و تێکۆشانێکی دورو درێژیدا هاتە کۆڕی سەرکردایەتی کردنی خەبات و تێکۆشانی نیشتمانی و نەتەوەیی . .

## تێکۆشانی سەرەتای ژیانی . .

سەرەك فەرماندە، هەر لە سەرەتای ژیانی منداڵیەوە، وەك هەستی پێکردبوو، وای بەپێویست زانیبو کە ڕەوتی ژیانی خۆی دەست نیشان بکات . . لە هەمان کاتیشدا هەستی هەتیوی پاڵی پێوەدەنا بەرەو دورەپەرێزی و گۆشەگیری . . شان بەشانی ئەوەش هەستی بەوەش کردبوو کە ئەبێ لە پێچ و پەناکانی ئەو چەشنە شێوە گۆشەگیریەیدا دەرچێ و لەخەڵك نێزیك ببێتەوە و پەیداکردنی پەیوەندایەتی وەك لەگەڵ کۆمەڵگای دێکەیاندا، ئەوە بوو دووهەم رێگەی هەڵبژارد و دەرچوونی لە پێچ و پەناکانی گۆشەگیری و دەربازبوون لە هەستی دوورەپەرێزی، بەڵام بۆ کوێ . . !؟ . . بەرەو ژیانێکی قورس و گران . . بەرەو خەبات و تێکۆشان و بەرهەڵستکاری دژی ژیانی ناهەموار وەك مرۆڤێکی بەبڕوا بۆ دابین کردنی پاشە ڕۆژی چارەنووسی خۆی . .

«گەردون» نەیدەزانی کە صدام چەشن و شێوەی زەوییەکی تینووە بۆ دڵۆپێ ئاو . . ئارەزومەندی فێربوونی خوێندن و زانینە کە ئەبێ دەست نیشانی پاشە ڕۆژی خۆی بکات لە نێویدا، بەرەو روناکی و تیشکی ڕۆژی ژیانی نوێ . . ئەوە بوو لە ساڵی 1947 - لەتەمەنی دەساڵیدا بڕیاری بیری خۆی بەجێ هێناو ڕوویکردە شاری تکریت بۆ ماڵی خاڵی «حاجی خیراللە طلفاح» بۆ بەجێ هینانی ئامانجەکەی . . کە لە ئەنجاما خواستەکەی لەلایەن خاڵیەوە بەبەرزیەوە وەرگیرا و پێشوازی کرا و ئامانجەکەی وەدی هات و چووە قوتابخانەی سەرەتایی تکریت دوایی هاتە ئامادەیی کەرخی بەغدا .

لەو کاتەدا عێراق بەتێکرا . بەتایبەت شاری بەغداد لە گڕ و هەڵچووندا بوو . . صدام حسین یەکێ بوو لەو لاوە خوێن گەرمانەی کە دەرونی قوڵپی دەدا دژی رژێمی بۆگەنی و بێگانە پەرستی و هەڵوێستی ئەو رژێمە بەرانبەر بە دەستدرێژیەکانی ئیمپریالیزم بۆ سەر گەلی عەرەبی میسری

## یەکەم سەرەتای تاقیکردنەوە . .

بە صدام حسین ڕاگەیاندرا کە لەبەغداد داواکراوە . . بەپێی فەرمان گەیشتە لێپرسراوەکەی پێی ڕاگەیاندرا کە ئەرکی لێدانی عبدالکریم قاسم - ی - دراوەتێ . . پێی خۆش بوو و شانازی پێوە کرد کە پارت ئەمی هەڵبژاردوە بۆ ئەم شێوە ئەرکە و بڕوای خستۆتە سەرلە ڕۆژی «7» تەشرینی یەکەمی «1959»دا صدام حسین لەگەڵ کۆمەڵە لاوێکی خوێن گەرمی بەعسیدا دەستریژیان لە عبدالکریم قاسم کرد لەشەقامی ڕەشیدا بۆ تۆڵەسەندنەوەی گەل لەو زۆرداره، هەرچەند لە نەخشە و پلانی دانراودا سەرنەکەوتن . . بەڵام لە هەمان کاتیشدا بەچاوێکی بەرز و ڕێزلێنانەوە لە لایەن سەرکردایەتی پارتەوە «پارتی بەعسی عەرەبی سۆشیالست وەهەڵسەنگێنران بەڵام لەو دەستریژەدا صدام حسین قاچی کەوتە بەرگوللەیەك و بریندار کرا لەکاتێکیشدا گەر بێت و ئەو هەڵسەنگاندنە بخەینە لاوە . . لەڕووی سیاسەتێکی گشتیەوە . . یان لەڕووی ئایدەلۆژیتی پارتی بەعسەوە بەڵام لەهەمان

كاتيشدا بەهيچ شێوەيەك ئينكارى دلێرى و چاونەترساوى ئەو لاوە خوێن گەرمانە ناكرێ كە يەكەمين بزمارێك بووە و كوتراوە بە لاشەى تەرمى زۆرداريدا كە بەتونديەوە كوڵەكەى بنكەى ئەو رژێمەى هاژاندبوو . .

صدام حسين، لەژێربارى ناچاريداو بۆ ئەوەى نەكەوێتە دەست و داوى چڵكاو خۆران و ئاگاييەكانى رژێمى قاسمى، شێوەى نێچيرێكى ئاسان ـ بەيارمەتى دانى لەلايەن خزم و كەس و كار و هەڤاڵەكانيەوە بەقاچێكى گوللە پێكاوى ،توانى لە سنورى عيراق دەربازبێ بەرەو سوريا، لەوێدا بۆ ماوەى سێ مانگ لە دمشق مايەوە كە لە ئەنجامدا لە رۆژى «21»مانگى شوباتى «1960» دمشق ـ ى ـ بەجێ‌هێشت بەرەو كۆمارى ميسر لەوێدا لە پۆلى پێنجەمى ئامادەيى «قصرالنيل» وەرگيرا و لە گەڵ هەڤاڵەكانيدا ژيا لە گەرەكى «الـدقي»و هەميشە بە تەنگى خوێندنەوە بوو شان بەشانى ئەو گۆرانكاريانە كە لە نيشتمانى عەرەبيدا رووى دەدا لەوكاتەدا «لە رووى سياسيەوە»و لە ئاسۆى بيرو فكرێكى بەرێن و فراوان!! دەژيا كە لە ميسردا بوو خوێندنەكەى بباتە سەر و بگاتە كۆلێجى ياسائى سەر بە دانشگاى قاهرە . .

پاش سەركەوتنى شۆرشى «8»شوباتى «1963» «14» رەمەزانى پيرۆز» «بووكى شۆرشان» هەڤالى لاو . . صدام حسين گەيشتە بەغداد . . بەلام ئەركێكى بەرپرسيارى قورس و گران چاوەروانى دەكرد، . بەلام لەگەڵ هەستانى بەئەركى پێسپێراويشييدا لە نيو بينى بيرهۆشى خۆيدا هەستى بەوەش كردبوو كە رودانێك لە رووى سياسى پارتدا رودەدا، بەهۆى دياردانى هەندێ شت كە بەديى كردبوو و سەرنجى راكێشابوو، تەگەرە لە رێبازى شۆرش دەدات و بەرەو نەمان روو دەنێ بێگومان ئەمەش خۆى لەخۆيدا بيرقوولى و شارەزايى و وورد بينى صدام حسين دەردەخا لەو بار و دۆخەدا

ئەوە بوو پاش چەند مانگێك هەست پێكردنەكەى صدام هاتە دى لە وەرگەراندنە رەشەكەى عبدالسلام عارف لە رۆژى «18» تەشرينى دووهەمى «1963»دا.

بێگومان ئەم هەڤاڵە تێكۆشەر و خوێن گەرمە دووبارە كەوتە ناو گێژەڵوكەى بير و فكرەوە بۆ چۆنێتى دووبارە ريكخستنى شانە و ريزەكانى پارت جگە لەو درۆو دەست هەڵبەستانە كە دژى دەكرا بەتايبەت كوشتنى جوتيارێك . .

بێگومان هيوا و ئاوات و ئامانج بە هچ شێوەيەك لە دڵ و دەرونى تێكۆشەراندا كوژاندنەوەى بۆنيە هەر چەند كارەساتى پێچەوانەيى روويان تێبكات . . بەڵكو بڵيسەى ئاگرينى بەردايە دڵ و دەرونى صدام حسين ـ ى ـ تێكۆشەر بەرەو خەباتێكى بێ‌ووچانى بەرەو پێكهێنانى كۆمەڵێكى نوێ لە هەڤاڵەكانى ،كە لەئەنجامدا سەركەوت لەو پێكهێنانەدا كە ئەندامەكانى بريتى بوون لە «15» كەسى ئەندام «لاوى تێكۆشەر و خەباتگێر ـ صدام حسين ـ دووبارە بەدەستى رۆژگارەوە بەچەندەها تەنگ و چەڵەمە و گير و گرفتدا تێپەرى . . بەڵام بەو پەرى هۆشمەندى و وورد بينى و ئاگادارى و شارەزايتى خۆيەوە، چارەسەرى دەكردن و ماوەى پەرەسەندنى نەدەدانێ . . »

### گەمارۆ دان و گرتنى صدام حسين . .

پياوەكانى رژێم شوێنە نهێنى‌يەكەى صدام حسين ـ ى ـ سەركردەيان گەمارۆ دا . . بەلام . ئايا ئەمە ئەو كاتەبە كە ئەم شاسوار و خەباتگێر و تێكۆشەرە بەو شێوە ئاسانيە بكەوێتە داوى دوژمنەوە . . !؟

پێشەوا كە ئەوەى بينى ووتى . . ئايا هەموو شتێك برايەوە و كۆتايى هات و ئەبێ هەردوو دەستەكانى لە زريەدا بەند كرێن!؟ هاوارى بەروخانى رژێمى عبدالسلام عارف كرد .

### صدام حسين و بريارى بەندكردنى . .

لەبەنديخانەدا سەرەكى پێشەوا، ژمارەيەك ئەو خونچە گوڵە بوو كە بەهيچ جۆرێك هێزى رەشەباى بۆگەنى كوڵى

پێنەدا، هەر وەك كوڵی نەداوە لە پێشا.. بەڵكو پتر هەستا بە ئەركی لێپرسراوی، لەنێو ئەو ئامۆژگاریانە كە پێشكەشی دەكردە هەڤاڵەكانی و دڵخۆشی دانەوەیان لە كۆبونەوەیێكی رێكەوتا، بەتایبەت لەشەواندا كە توانی چەند سەربازێك لە پاسەوانەكانی بەندیخانە راكێشی بۆ لای خۆی، كە بەشەوان دەرگای ژوورەكانی بەندیخانەكەیان دەكردوە بۆیان و هەڤالان دەگەیشتنە یەك و كۆدەبونەوە، لە پێناوی ئەوەی هەستی پڕو پووچ كار نەكاتە سەر هەڤالان و خاو بنەوە، لە هەمان كاتیشدا تێدەكۆشان بۆ دانانی پلانێك بۆ دەرچوون و دەربازبوونیان لە بەندیخانە، بەلام ئەوەی بۆی دەچوون كاری رێكەوت هەڵیدەوەشاند،

بریاری بەدادگادانی صدام حسین و هەڤاڵەكانی درا، بەلام پێشی گواستنەوەیان بۆدادگا بەچەند رۆژێك ئاگاداری رێكخراوی پارت كرا (لەدەرەوەی بەندیخانە) بۆ ئەوەی بەكاری خۆی هەستێ.

ئەوە بوو لە نێو هالوگۆركردنی نامە و نووسراودا نەخشەی رێگەیان دەست نیشان كرد بەتەواوی نەخشەی پلانەكەش بۆ راكردن دانرا بوو، بەتایبەت پێشەوا نامەیێكی نارد بۆ «سعدون شاكر» كە لەرۆژی تەرخان كراودا لەجێگە و شوێنی دانراودا ئامادەبێ..

نەخشە و پلانەكەش بەم شێوەیە بوو، كە لە كاتی بردنیان بۆ دادگا بەسەربازەكان قەناعەت بێنێ كە پارووەیەك نان لە چێشتخانەیەكدا بەیەكەوە بخۆن «چێشتخانەی جندول» لە شەقامی ئەبونەواس».. هەڤاڵی ئەرك پێسپێردراو «سعدون شاكر» بەپێی نەخشە ئۆتۆمبێلەكەی ئامادەبكات و لە تەنشتی نزیك بە دەست شۆرەكەوە رایگرێ و دەرگاكانی كراوەبێت بۆ ئەوەی یەكێكیان بە هۆی دەست شۆردنەوە خۆی بگەیەنێتە ئۆتۆمبیلەكە و ئەو هەڤاڵەكانی قەناعەت بەسەربازەكان بێنن و خەلاتێكی گەورەیان بكەن پاش سەركەوتنی شۆرش..

سەرۆك یەكەم كەس بوو خۆی گەیاندە ئۆتۆمبیلەكە، بەلام سەربازەكان بەهەموو بەلێن و پەیمانەكانی هەڤالان قەناعەتیان نەهێنا و سوور بوون لەسەر گەراندنەوەیان بۆ بەندیخانە.

## رۆژی «23»ی ـ گەلاوێژی 1966

رۆژی «23»ی گەلاوێژی «1966» بەرۆژێكی مێژوویی دادەنرێ.. ئەو رۆژە كە صدام حسین كۆت و زنجیری دەرگای ئاسنی بەندیخانەی شكاند بە بیرو باوەڕێكی بەرزەوە بۆ ئامادەبوونێكی تەواوی لە پێناوی ئێكجاری شكاندن و تێك دانی دەرگاكانی بەندیخانەكان كە بووبووە هۆی و مەڵبەندی ئازار و ئەشكەنجەدانی گەلی عێراقی تێكۆشەرمان.

پاش رزگاربوونی هەڤاڵی تێكۆشەر صدام حسین دەستكرا بە خۆ ئامادەكردن و رێكخستنی ریزەكانی پارت لە پێناوی رامالینی شەوی تار و ژیانی نائەمواری و بەرز بوونەوەی رۆژی نوێ لە ئاسۆی بەرەبەیانی نیشتمان و نەتەوەدا.

## سەركەوتنی شۆرش..

دوای هەڵسەنگاندنێكی وورد بینی لە باروودۆخی رژێمی عارفی و روون بوونەوەی ئەو راستەقینەیە بۆ سەركردایەتی پارت كە رژێمی عارفی رۆژ بەرۆژ بەرەو لە ناوچوون روودەنێ.. هەرواش بە هیچ شێوەیەك ئەو باروودۆخە شلەژاوە چارەسەركردنی بۆنیە بەشۆرشێكی گەلی نەبێت..

بۆئەم مەبەستە، سەركردایەتی پارت هەستا بە ئامادەكردنی خۆی كە بەزووترین كات بەدەوری نیشتمانی و نەتەوەیی هەستێ بۆ بەرپا كردنێكی شۆرش و روخاندنی رژێمی بە كرێ گیراوی لە عیراقدا، كە صدام حسین ـ ی ـ لاوو تێكۆشەر و خەباتگێر گێژەنگەی ئەو بزوتنەوە بوو لەرێكخستنی ئەندامان و ریزەكانی پارت و پێشرەوی كردن هەڤاڵەكانی بەرەو ئامادەبوون لە كاتی دانراودا «لەكەرتەكانی

شارستـــانـی و سوپــایی»و دابــەش کردنی چەك بەســەر شۆڕشگێڕاندا - ئەوانەی کە هەڵبژاردراون لە لایەن سەرکردایتی‌یەوە.

بەپێی نەخشەی کات و جێگای دانراو، کۆبونەوە دەستی پێکرد و هەریەکی فەرمانی ئەرکی خۆی وەرگرت کە چۆن پێی هەستێ،، هەڤـالان، لە سەرویـانـدا سەرەك پێشـەوا صدام حسین بەجـل و بەرگی ئەفســەری و سەربـازیـەوە روویان کردە کۆشکی کۆماری و ناچار کردنی عبدالرحمن عارف بۆ خۆ بە دەستەوە دان بە هێزی شۆڕش.

## پاکش کردنەوەی شۆڕش لە خزاو و ناپاکان

پاش سەرکـەوتـنـی شۆڕش بەچـەنـد رۆژێـك ،صــدام حسین - ی - پێشـرەو و سەرکـردەی سەرکـەوتنی شۆڕش چەنـد بارێکی گرنـگ بیـری راکێشـا مەترسیـەکی گەورە نشتە لاشەیەوە، بیری لەوە دەکردەوە، ئەبێ هەموو ئەو هێزانە «زریەی و تانکەکانی» لە جێگەی خۆیاندا جووڵە نەکەن، نەکوا ئەو خزاو و گومان لێکراوانە کە سەرکردایتی پارت لە ژێر باری ناچاریدا و لەپێناوی راپەراندنی شۆڕش وەریــانی گرتبــو، هەستن بە دوور خستنــەوەی هەڤـالان و بەخـۆیـان دەست بەسـەری شۆڕشدا بگرن، صدام ئەمەی راگەیاندە هەڤالان و بەلێنی دانێ کە بەخۆی شۆڕش پاکش بکاتەوە لەو ناپاکانە.

«ابـراهیم الـداود و عبـدالـرزاق نایف» ئەوە پاش خەم و خەیـاڵ و پەژارە و نەخـەوتنێکی دوانگـزە رۆژی، بڕیاری دا کە لەمـە زێـدەتـر نەوەستێ، لەکـۆبـوونەوێیکی ناکاویدا بە •هەڤاڵەکانی راگەیاند، هەموویان سەرجەم ووتیان، لەگەڵتاین..

صدام - ی - بەرپرسیار ووتی.. سبەینێ ئەوکاتە شیاوەیە..

لە رۆژی دووهــەمــدا رێکـەوتی «30»ی - گەلاوێـژ - سەرۆك پەیمان بەڵێنەکەی بەجێ هێنا و عبدالرزاق نایفی لە عیـراق بەدەرکـرد «ئـەوکـاتـە عبدالرزاق نایف بە سەرەك شالیارانی دانرا بوو، بەپێی نەخشەی سەرکەوتنی شۆڕش» بۆ باڵـوێـزی عیـراق لە هەرێمی مەغرب، هەروا دەرهێنانی فەرمـانی دوور خستنـەوەی ابـراهیم الـداود کە لەوکاتەدا بە شالیاری بەرگری دانرابوو،، کە لە دەرەوەی هەرێمدا بوو «لــە هەرێمی ئەردن».. ئـەوەبــوو سەرۆك پەیمـانی خۆی بەجێ‌هێنـا و ووتی ئۆخـەی و هەنـاسـەیێکی شادمـانی پر بەسنــگ لە بای رزگـاری هەڵگێشـا، بە پاکش کردنـەوەی شۆڕش لەو ناپاکانە کە خۆیان سەپاندبووە سەر شۆڕشدا

بێگـومـان ژیـانی خەبـات و تێکـۆشـانی سەرەك پێشەوا هەڤاڵ تێکۆشەر صدام حسین گەر بێت و بەدوور و درێژی لێ بکۆڵینەوە بە دانانی چەندەها کتێب تەواو نابێت بەڵام ئەو لێکۆڵینەوە بۆ گەلی عیراقی خۆشەویست و سەربەرزمان بەجێ دەهێڵین کە بەخۆی دەزانێ چۆن و چۆن بووە و چۆنە..

سنووری عیراق شورەی پۆڵاینەو لەهێزنیە
بتوانێ بیشکێنێ



# ٧ ی نیسان
# و دەسکەوتەکانی شۆڕش

● فؤاد حسین ●

له حەوتی نیسانـدا مۆمێکی تر دادەگیرسێنین و تەمەن درێژی بۆ حیزبی سەرکردەمان حیزبی بەعسی عەرەبی سۆشیالیست دەخوازین و ئومێدەوارین له تێکۆشان و وەدەرهێنانی ئامانجە پیرۆزەکانی گەلەکەماندا بەردەوام بێت . . .

دیسان هەر له هەمان مانگ دا ئەستێرەیەکی گەش و قارەمانێکی داناو هەڵکەوتوو له دایك بوو ئەویش هەڤاڵی تێکۆشەر کاك صدام حسین - ه . .

ئەم دوو بیرەوەریە پیرۆزە هەتا هەتایە له ئاسمانی میللەتەکەماندا دەدرەوشێنەوەو ڕوناکیی پێ ئەبەخشن . .

لەدایك بوونی حیزبی سەرکردەو ئەستێرەی گەل کارێکی گەورەو مەزنیان کردە سەر ژیانی گەلەکەمان و ڕەوڕەوەی پێشکەوتنی نیشتمانەکەمان . . . نیشتمانەکەمان سەربەخۆیی تەواوی خۆی وەرگرت و جەماوەرمان سەربەست و سەرفراز بوو ماوەی سی و حەوت ساڵی خەبات و تێکۆشانی بەردەوام . .

حیزبەکەمان له باوەشی جەماوەردا گەورە دەبوو، توانی بەرە بەرە جەماوەرێکی فراوان له چواردەوری خۆیدا کۆ بکاتەوەو بڕوای پێ بکەن و بێنە ڕیزی ئەندامەکانیەوە شان بە

شانیان تێبکۆشن و خەبات بکەن... لەم ماوەیەدا حیزبی سەرکردەمان توانی ڕووبەرووی جۆرەها بەرەو هێزی هەڵگەڕاوەو دوژمنان بوەستێت و بەرەنگاریان بێت و سەرکەوتن وەدی بهێنێت.. هەرلە عەینی کاتیشدا لەکاری بنیاتنان و وەدیهێنانی دەسکەوت و بەخششە مەزنەکانی بەردەوام بوو. گرنگترینیان دروست کردنی یەکێتی نێوان میسرو وولاتی سوریادا، بەپاکردنی شۆرشی هەشتی شوبات لە عیراقدا، دوا بە دوای ئەمەش داگیرساندنی شۆرشی هەشتی ئادار لە وولاتی سوریادا..

شۆرشی 17 ـ 30ی گەلاوێژ ساڵی 1968 لە عێراقدا.

دانانی یاسای ئۆتۆنۆمی بۆ میللەتەکەمان لەچوارچێوەی کۆماری عێراقدا، هەرچەند گەلێ حوکوماتی پێش شۆرشی 17ـ 30ی تەموز نەیانتوانی چارەسەری گیروگرفتەکە بکەن و کۆتایی بە شەڕو کوشتاری نێوان هەردوو برا کوردو عەرب بهێنن..

خۆماڵی کردنی نەوت لە یەکی حوزەیرانی ساڵی 1972 دا..

دروست کردنی بەرەی نیشتمانی، دانانی یاسای کشتوکاڵ و دابەش کردنی زەوی‌و زار بەسەر جوتیارەکانداو کۆتایی هێنان بە دەرەبەگ و زوڵم و زۆریان.. لەناو بردنی نەخوێندەواری لەسەرانسەری وولاتەکەماندا خوێندنی تەوزیمی‌و خوێندنی مەجانی.. دانانی سەدەها پرۆژەی مەزن لە گشت ناوچەکانی وولاتەکەماندا... باش کردنی گوزەرانی خەڵکی‌و دابین کردنی پاشەڕۆژی مندالانمان بەستنی گشت شارو دێهاتەکان بەیەکەوە بە دروست کردنی هەزارەها کیلۆمەتری ڕێگاو بان.. چارەسەرکردنی کێشەکانی وولات، وەکو خانوو، گواستنەوە، جۆرەها خزمەت گوزاری لە ڕاستیدا ئەم دەسکەوت و بەخششە مەزنانە بوونە هۆی ئەوەی دەزگاکانی ئیمپریالیزم و زایۆنیزم هەست بە مەترسی بکەن و بگەنە ئەو ڕاستیەی کەوا دەسەلات و بەرژەوەندییان خەریکە لەناو دەچێت و وولاتانی تری عەرەب چاو دەبڕنە عیراق و ڕەنگە شۆرشێکی گەورەی عەرەب بەرپابێت و نەمانی ئیجگاری بۆئەوان بنووسرێت..

لێرەدا دەستیان کردە پیلان دانان و بەکار هێنانی جۆرەها شێوەو ڕێگا بۆ ئەوەی دەستی خۆیان لە دەسکەوتەکانی شۆرش بوەشێنن، یان ناوەڕۆکەکانیان پوك کەنەوەو لە ڕەسەنایەتی‌ی نەتەوایەتی دووری خەنەوە.. لە سەرەتادا توانییان شۆرشی 8ی شوبات لەناوەدن و دایمرکێنن، دیسان توانیان هەڵگەڕاوە شوباتیەکە بەرپابکەن، لە ڕاستیدا بۆ سەرکردەی شەرعی‌ی حیزب لە سوریادا کەین و بەیەکە کرا، بوە هۆی ئەوەی شۆرشی هەشتی ئادار لە ڕێگای ڕەسەنی‌و ناوەڕۆکی پاکیدا لابدات..

هەرچەند هێزەکانی دوژمنی حیزب گەورەو زۆر بوون و هەرچەند دەست وەشاندنەکانیان قورس و توند بوون بەلام حیزب لەوان بەهێزتر بوو توانی بەرەنگاریان ببێتەوەو کۆڵنەدات، لە خەبات و تێکۆشانیدا بەردەوام بێت، جەماوەری گەلەکەمان گەلێ بەحتەوەر بوو کە دەستیان بگرێت و پێشیان کەوێت و ببێتە ڕابەریان ئەویش هەڤاڵی تێکۆشەرو خەبات گێڕ کاك صدام حسین ـ ە.

تێکۆشەر صدام حسین توانی بۆ جارێکی‌تر بنیاتی شانەکانی حیزب بنێت و ڕێکیان بکات بە ئاراستەو ئامۆژگاری‌و ڕاوێژەکانی بیگەڕێنێتەوە بۆ دۆخ و هێزی جاری جاران.. بە جۆرێك بتوانێت لە نێوان جەماوەردا بجوڵێتەوەو ڕووبەرووی بەرهەڵستکاران و دوژمنان و دەسەلاتی کۆنەپەرست ڕاوەستێت.. تاتوانی بەسەریا سەرکەوێت و شۆرشی 17ـ 30ی تموز بەرپا بکات... لە ڕاستیدا سەرکەوتنێکی گەورەی وەدی هێنا.. کە بوە سەرەتای قۆناخێکی نوێ لە کاروانی پارتی بەعسی عەرەبی سۆشیالیست دا.. و ڕەورەوەی گەلە قارەمانەکەمان..

بۆ جارێکی‌تر دام ودەزگاکانی ئیمپریالیزم و زایۆنیزم کەوتنە



جوڵەو بیرکردنەوە بۆ دۆزینەوەی پیلانێکی نوێو ڕاسپاردنی لایەنێکی‌تر، ئەم جارە دوژمنانی گەلەکەمان و ئەو لایەنانەی کە بەناو عەرەبن و تەنها تەسکەرەی عەرەبیان هەیە وەکو ڕژێمی سوریاو قەزافی‌ی لەگەڵ زایۆنیستەکان کە لەبنچینەدا خوێن مژی گەلی عەرەبن و دژی گشت جۆرە چالاکیەکی پێشکەوتن.. ئەمانە گشت خومەینی‌و تاقمە گەوجەکەیان ڕاسپاردو ئەم شەڕە دروستکراوەیان کە بەسەر وڵاتەکەماندا سەپاندیان بەرپاکرد... گرەویان لەسەر کرد کە ئەم جارە عیراق دەبێتە پارۆیەك و بە ئاسانی دەخورێت ئێران و سوپاکەی کە بە پێنجەم هێزو سوپای جیهانی دەژمێردرێت وڵاتی گەورەوپان و بەرینی ئێران خاکی عیراق قوت دەدات و دەخرێتە پاڵ خاکەکەیانەوە...!!؟

خومێنی‌ی داخ لەدڵ و داردەستەکە لە هەموو لایەکەوە یارمەتیان پێ گەیشت، بەگشت جۆرو چەشنێك پشتیوانی کران.. بەڵام قارەمانی گەل هەڤاڵ صدام حسین و سەربازو ڕۆڵە بە جەرگەکانی نیشتمانی عیراق، توانیان پیلان و چەك و سوپاو ئالەتەکانی جەنگیان تێك بشکێنن و وانەی مێژوویان بدەنێ. هەتا هەتایە لە یادیان نەچێت...

ڕۆڵەنەبەزەکانی قادسیەی دووەم هەر ڕۆژ لەسەر سنوری نیشتمان داستانی قارەمانانە تۆمار دەکەن و ژمارەی زۆر لە سەربازەکانی جادوباز ڕەوانەی دۆزەخ دەکەن... ماوەی پێنج ساڵە خاکی عیراق پارێزراوەو دەپارێزرێت و دوژمن شکەستەو تووشی سەریەشەو نوشستی دەبێت و تا لە دواییدا وای لێ هاتووە هەر ڕۆژ بەسەدان لە سەربازەکانیان هەڵدێن و خۆیان ئەدەنە دەست سوپاکەمانەوەو خۆیان لە دۆزرەخی ڕژێمی خومەینی ڕزگار دەکەن...

عیراق و سەرکردە داناکەی باری ناوەوەو بنیاتنانیان لەیاد نەکردووە، شان بە شانی سەرکەوتنەکانمان لە گۆرەپانی جەنگدا، وڵات لە بنیاتنان و زیاد کردنی بەرهەم و ئیشر کردندا بەردەوامەو نیشتمانەکەمان لە ڕەوڕەوەی پێشکەوتن ڕاوەستان نازانێت...

ئێرانیش هەمیشە ڕوو لە نەمان و دواکەوتن و سووتان دەنێ‌و تاریکی باڵی بەسەر گشت کون و قوژ بنێکی وڵاتدا کێشاوە... دوژمنانیش ڕووڕەش و ناهومێدو خەجاڵەت بوون...

بیرەوری ئەمساڵمان تام‌وچێژێکی تری هەیە.. تێکەڵ بە سەرکەوتنەکانمان دەبێت و کامەرانی‌و خۆشیمان گەورەترو مەزنتر دەبێت...

دووبارە تەمەن درێژی بۆ حیزب و سەرکردە قارەمانەکەی حیزبی بەعسی عەرەبی سۆشیالیست و هەڤاڵی تێکۆشەر صدام حسین.. بە بۆنەی داگیرساندنی مۆمێکی نوێ لە - تەمەنیاندا...

# فرمێسکێ بۆ کوردستانی شێران

وێنەیێك لە پەخشانی کوردی

نوری علی أمین



(1)

تاسەی دڵ،
لە کوورەی دەروونمدا،
لە هەواری دەربەدەریمدا،
بۆ دیدەنی شارەکەم[1] قوڵپی ئەدا. .
لە لادێوە بەرەو شار کەوتمەڕێ،
بەناو چیای سەخت و
دارستانی چڕی سووتاودا،
پەلم دەکوتا. .
بەناو دەشت و،
ڕووباری بە خوێن سوورکراودا،
هەنگاوم دەنا.
بۆ دیدەنی شارەکەم،
پێم بە جەرگی خۆمدا دەنا. .

(2)

بەڵام شاریش وەك لادێ. .
لەناو دەمی مەرگا،
تاڵاوی دەچەشت. .
لەناو دارو پەردووی گڕگرتووتدا
شەهیدی دەناشت. .
لەبرسا،
خوێنی ڕژاوی برای خۆی دەلستەوە. .





له تینوێتیدا،
ئارەقی ناوچەوانی خۆی دەخواردەوە..
(3)
هێشتا جاڕدەر، جاڕی دەدا:
کەس لە ماڵ نەجوڵێ،
شار بەجێ نەهێڵێ،
مردوو نەنێژێ،
شیوەن دانەبەستێ..
رەشەبای مەرگ:
رقی لەم شارە هەڵ گرتووە،
سوێندی بە هێتلەر خواردووە،
ئەی گوێزێتەوە..
خاکی بە توورەکە دەبێژێتەوە،
کۆڵان بە کۆڵان دەسووڕێتەوە،
کەللە سەر خڕ دەکاتەوە،
دەوری زووحاك زیندوو دەکاتەوە..
سەر لە نوێ:
گریان لە چاوا دەڕوێنێ..
گڕ لە دەروونا دەچێنێ..
گوڵ لە باخا هەڵ دەوەرێنێ..
گورپە لە هێلانەی ئاراما، دەسوتێنێ..

ڕەوا لە جێی ناڕەوا هەڵ دەواسێ. .
داری ئازادی،
لە ڕەگە هەڵ دەکێشێ . .
لە شاری جوانە مەرگدا،
لە مزگەوتی سوتێنراودا،
لە شەقامی چوار چرادا،
بە خوێنی شەهیدان،
بە فرمێسکی گەرمی دایکان،

دەست نوێژ دەگرێ. .
لە کوڕی گورگەکاندا، دەنەڕێنێ. .
خوێنم بۆ بڕژێنن. . .
بەخوێن تینوێتیم بشکێنن. .
بەزەیی لە دڵما بتەکێنن. .
تۆڵەی زووحاکم بۆ بسێنن.
ئەژدەهاکم. .

کەللەسەرم بۆ بپەڕێنن.
مۆخەکەیم بۆ بهێنن. .
پیشەی باوانم مەدوێنن. .
باڵندەکانیش لە شارا،
لەتاو هێلانەی سوتاویان،
لە ترسی گوللەی وێڵ،
یان ئاگری نێلەنێل،
کەوتبوونەڕەو. .
بەبێ دان و. .
بەبێ خەو. . .
هەتا کۆتری ئاشتی بدۆزنەوە. .
بەسەرهاتی ئەم شارەی بۆ بگێڕنەوە. . .

(5)
منیش وەك باڵندەکان،
لە شار دوورکەوتمەوە. . .
لەژێر سێبەری،

داربەڕووەکانی قەراغ شارا،
لەپاڵ کێلەبەردەکاندا، شانم دادا. .
هێشتا چاوم،
لە گۆمی خەوا، وەنەوزی دەدا. .
لە پڕ هێلانەی شار هروژا،
لە هاواری دایکی دڵ سوتاودا،
لە ناڵەی باوکی جەرگ براودا،
ناوی شەهیدەکان دەنگی دەدایەوە. .
بە چاوی پڕ لە فرمێسکەوە،
ناوی شەهیدم دەقواستەوە. .
بە خوێنی زامەکەم،
لەسەر گەڵای داربەڕووەکان،
ناوەکانم دەنەخشاندان. .
لە گلێنەی چاوی کوردا،
جێم بۆ دەکردنەوە. .
لە مێشکما ڕایەخی ماڵاواییم،
بۆ ڕادەخستن، . . . پێم دەگوتن:
بخەوون. . شەهیدن. . نەمردوون،
هەتا کورد بمێنێ زیندوون. .
دڵنیابن، خوێنی ڕژاوتان:
یادی داستانی دمدم،
کارەساتی گەڵباخی
سمکۆی قارەمان
قازی محمدی شەهید، دەژێنێتەوە. .

# پەژارەم بۆ کوڕانم و لاوانی نیشتمانم

## «بیستەی لەمەزار بێژ و پەند»

دامەزراو ..
وەکۆکردنەوەی مەعروف جیاوك
ساڵی ١٩٣٨

غفوری میرزا کریم

گومان لەوەدانیە کە گەلی کوردیش وەکو هەموو گەلێکی بێ گەییو زیندوو لەم جیهانە گەورەیەدا خاوەنی گەنجینەیەکی، یەکجار بێ شومارەو خەرمانێکی هەرە مەزنی لەجەوهەری ئەدەبی کلاسیکی و پەندو ئامۆژگاریو بەیت و چیرۆك و لاوك و بەستەو سازو ئاوازو کەلەپوری نیشتمانیدا، میراتێکی زۆری بەجێ هێشتووەو کەڵەکەی کردووە بەجۆرێك کە نەوەی ئەمڕۆ ماف بەخۆی ئەدا کە بەو پەڕی شانازی‌یەوە ئەم گەوهەرو پیروزە بەنرخە وەکو گلینەی چاوی بپارێزێ و بایەخی پیبدات و ڕێزی لێبگرێت هەوڵ و تەقەلای بێ وچان بدات بۆ پاراستنی ئەم سامانە گەورەیەو زیادکردن و دەوڵەمەندکردنی تاکو لە دواییدا ئەم بەهرەو دەسکەوتە ڕیزبکات و نیشانی بدات لە بارەگای تەماشاخانەی گەلانی پێشکەوتوی خەبات کەردا.

ئەم سەروسامانە نرخدارە کە زادەی بیری ڕووناك و تاقیکردنەوەی چەند ساڵەی نەوەی ڕابردومانەوە نەبێت دەست کردی تەنیا یەکێك یان دەستەیەك یان چینێك یان قۆناغ و پلەیەکی تایبەتی کۆمەڵایەتی مێژووی گەل بێت، بەڵکو جێگای خۆیەتی ئەگەر بڵێین وەك دارێکی بەژندار کەرەگ و ڕیشەی لە ناو دڵ و دەروونی گەلدا داکوتاوە . .
مێژووی ئەگەڕێتەوە بۆ ڕۆژگارێکی دەوری ڕابردوو ئەچێتەوە سەر ئەو ڕۆژەی کە گەلی کورد چاوی ڕووناکی لەم وولاتەدا پشکوتو مەلاشوی هەڵهێنا بە ئاوی سازگاری چیا بەفرینەکانی دڵ و مێشکی کراوەتەوە بۆ جوانی و دڵگیری خاك و خۆڵەکەی واتە ئەم سەروسامانە بەری ڕەنجی ساڵەهای ساڵی ئەو گەلەیە کە دەستی داوەتە زۆرانبازی و بەربەرەکانی لەگەڵ سروشتدا ڕازی دڵ و دەروونی خۆی کردووە بە گەوهەری شەو چراخ و ڕیزی کردووە، کردویەتی بەپەندو ئامۆژگاری تایبێتە دەستوری ڕۆژانەی ویستویەتی سوودی لێ وەربگرێ و ببێتە سەر مەشق دا دەری بۆ کاری باش، بۆیێشەوە چۆن و ڕێك وێکی ژیانی کۆمەڵایەتی بۆ

ـ ڕشتنی شیرازەی برایەتیو ڕواندنی داری دۆستایەتی.

جێگــای خۆیــەتی کەبڵێین ئەم کەلـەپـوورە نیشتمـانیـە ـەنجـامی بەرا وردکــردن و تاقیکــردنـەوەیـەکی تاڵ و ـەموەهاتوتە کایەوە، لە ناوجەرگەی بەسەر هاتێکی گران و ـورسـدا ژیـان و ئەرکێکی ناخۆشیوا چوزەرەی دەرکردووە وتـا سەرکــەوتن و ژێـرکـەوتنی لەژیـانـاو بەرزی نشێـوی چەرخی گەردوون، هەڵدێرودا فێری کۆمەڵایەتی، تاوتووی پـێویستیـەکانی ژیان، بەربەرەکانی لەگەڵ سروشتدا چنگە گیـرکـردن وهـەوڵدان بۆباش کردنی گوزەران و مانەوەی لەم زەوییــەداو بەگــژا چوونی لەگــەڵ چەرخی چەپگــەردی گەردونـدا، بەکـورتی ژیـانی دوورودرێـژی تێکـۆشـانی بێ ووچـانی لەهـەمـوو ڕوویـەکـەوە، ئەمانە هەمووی هەوێن و ماکی قاڵبووی ئەم پەندە جوانە قەشە نگەو دروست کەری ووشەی شرینی دڵگیری سوودمەندە دیارە ئەم پەندو ئامۆژ گاریانە لەناوگە لدا بڵاوبوتەوە بەچە شنێکی فراوان و ڕەگ وریشەی بەتەواوی داکوتاوە وجێگای خۆی لەدڵ و دەروونی خەڵقـدا بەجـۆرێـك کردوتـەوە کە جیـانـابێتـەوە لەژیـانی ڕۆژانەی گەل و بەچەشنێ خۆی بە باڵای مرۆڤدا بریوە کە ماوەی جیابوونەوەی نیە.

ئەم ووشەو پەندە جوانانە دەماو دەم و پشتاو پشت هاتووە تاگـەیشتـوتـە زاری نەوەی ئەمـڕۆ کە ئەوخـەڵقەش هەریەکە لەجـێـگــای دیــاری کراودا بە پێی کات و ڕۆژی خۆی بەکاری ئەهێنێ بۆجێبەجێ کردنی مەبەستێکی تایبەتی بۆ ئاوڕشین کردنی دڵیخـەفـەت باریو سارێـژکـردنی زامی گیـانی بۆدامـەزرانـدنی بنچینـەی کۆمـەڵایـەتیو دارشتنی بناغەی برایەتیو گرێدانی پشتێنی دۆستایەتی.

ئەم پەنـدو ئامـۆژگـاریـانـە گەلێك زۆرن و بەچەشنێکی فراوان بڵاو بوونەوە دەرودەشت، شارولادێ، لە مزگەوت و خانـەقـاو کێڵگـەکـان و لەنـاو دڵ و دەروونی هەمـوو چین و توێژە جیاوازەکانی کۆمەڵدا تێکەڵ بەخەڵق و ژیانی خەڵقەوە بووە، پیاو ئەیدابە کوڕیو دایك بەکچی بەچەشنێك کەئەم پەنـدانـە دەوری خۆی ئەگێـڕێ لە ڕێـك و پێکی کۆمـەڵدا لەتـەخت کردنی کەنـدوکـۆسپـدا لەدامـەزرانـدنی بنچینەی ڕاستیو ئاوەدانیدا.

دیـارە هەرکـە سێـك ئەگـەربێت و هەستی بەئـەرکی کۆکردنەوەی ئەم پەندو ئامۆژگاریانە بکاوبیخاتە سەرکاغەزو تۆمـاری کابـە کارێکی نیشتمـانیو پێـویستیـەکی میللی ئەژمێـریو ئەبێتـە جێگـای شانـازیو ڕێزلێگرتن و سوپاس لەلایـەن ڕۆڵـەکـانی گەلـەوەوە ئەم هەوڵ و کۆششـەیان لەم مەیـدانـەدا لەبیرناچێتەوەو ناوی لەڕیزی نیشتمان پەروەریو کاروانی ڕۆشنبیـریـان تۆمـارئـەکـریو پەنچەی دڵسوزیو جوامێری بۆدرێژ ئەکرێ.

مەعــروف جیــاوك لەم ڕووەوە جێگــای ڕێــزگــرتن و ناوهێنـانیـەتی چونکـە لەوەختی خۆیـدا، پێش زیاتر لەسی ([illegible]) ساڵ لەمەوبەر ئەرکی کۆکردنەوەی هەندێ لەم پەندو پێشونانەی گرتوتە ئەستۆی خۆیو ئەم پێویستیە نیشتمانیەیی جێبەجێ کردووە کە بەڕاستی ئەمڕۆ ئەم هەنگاوە بەخزمە تێـك ئەژمێـردرێ کە ئەم پیـاوە ڕۆشنبیـرە کردویتی، وەهەتا هەتایە ئەم کارەلەبیرنەوەی ئەمرۆمان ناچێتەوە.

ئەم نامیلکـەیـە لەسەرپیتی کوردی. . پەندو شوێنەکانی نیا تۆمارکراوە نزیکەی 90 لاپەڕە ئەبێت نرخی فرۆشتنیشی (30) فلس بووە لەچاپخانەی [النجاح] لەچاپ دراوە وابۆ نموونە هەندێك لەوپەندانە بەگوێرەی پیتی کوردی ئەخەینە پێش چاوی خوێنەواران.

1 ـ ئیـشـی ئەمـڕۆ بۆسـبـەی مەهـێڵە، چونکـە شەو چیدەزێ نازانرێ.

2 ـ ئازایەتی لەلایەك هۆشیو گۆشی لەلایەك.

3 ـ ئەوەی چاڵ بۆدۆسـتـی هەڵـکـەنـێ خۆی سەربەژێرتیی ئەکەوێ.

4 ـ ئەوی لەقـسـەت گوێ ناگرێ تۆش باری قسەگوێ

- لیٚ‌کردنی لیٚ‌هەڵگرە.

5 ـ ئەوی بلندی خوٚی ریٚك نەخابە شی هەرزلتە.

6 ـ ئەوی بوٚنیش و کاری خوٚی سەرفروٚنەکا همیشەبرسی ئەمیٚنیٚ.

7 ـ ئەگەرئیش نەی بزوێنی بیٚ‌ئیشی ئەیکوژیٚ.

8 ـ ئەوی چاکی نەزانیٚ خراپی ئەزانیٚ.

9 ـ ئەگەر روٚژانی رابردوو پەندت نەدا روٚژانی پاش کەڵك ناگریٚ.

10 ـ ئەوی دوٚستی نیەمردنی چاکترە.

[ ب ـ پ]

1 ـ بیٚ‌دامیٚن گیرئە خلیسکیٚ‌ی.

2 ـ بازلەگەڵە بازوکوٚتر لەگەڵ کوٚتریان وتووە.

3 ـ پیاوی کەودەن هەربوٚمردن باشە.

4 ـ پرکی چڵکی‌و پیس پیٚکەوە ناسوٚریٚ.

5 ـ بەر لەقسەکردن حەوت جار زمان سوڕدە.

6 ـ بیرو هوٚش لەشیر بەکارترە.

7 ـ بوٚ وەتەنت شەش کوڕ بەخیٚوکە.

8 ـ بەهەشت خانوی بەخشندەیە.

9 ـ توکی سپی نیشانەی هوٚش و خردمەندی‌یە.

10 ـ تەماشای دڵ، نەوەکاتە ماشای ڕوو.

[ج، چ، ح، خ]

1 ـ چاکی هەرگیز گوم نابیٚت.

2 ـ خەڵوزفروٚش پادشا هی‌ماڵی خوٚیەتی.

3 ـ چاوی‌ی شەمشەمەکویٚرەو هەتاویان نەوتووە.

4 ـ خوی چاك دوٚستی زوٚرە.

5 ـ حەوت جار زمانت بگرەدوایی‌بیٚژە.

6 ـ خوٚشەویستی مردن لەچاویادیارە.

7 ـ پەتی دوژمنت بەدادوچاکی ببچڕیٚنە.

8 ـ پیاوی ماڵی خوٚیەتی.

9 ـ چاکی بکە لەپیٚش ئەوەی کەچاکیان لەتوٚبویٚ.

10 ـ خنکاو هەڵمەتی هەموو شتیٚك ئەبات.

[د، ر، ز، ژ]

1 ـ دیوار چاوی نەبیٚ گوێی هەیە.

2 ـ دڵوٚپە، دڵوٚپە ئەبیٚتە ڕووبار.

3 ـ زمان دریٚژی سزای برینی ئەبیٚ.

4 ـ رابردوو ناگەڕیٚتەوە بوٚی مەگەریٚ.

5 ـ دووبیر لەبیریٚ چاکترە.

6 ـ داری تەڕدووکەڵ ئەکا.

7 ـ دەستی دریٚژە [دزە].

8 ـ دەستی‌کورتە [لاتە].

9 ـ دوٚستی راست لەهەموو سامانیٚك بەکەڵك ترە.

10 ـ ڕووی خوٚش و شیرین کلیلی دڵە.

[س، ش]

1 ـ سامانی زوٚر، رەنج و دەردی زوٚر.

2 ـ سەری قازی هەیە [گەوجە].

3 ـ شوٚرش و هەزاردەرد.

4 ـ سامان ئەسوتیٚ‌و توون ئەبیٚ، بەڵام زانین و دانش ناکوژیٚتەو هەمیشە هەلاووئەدا.

5 ـ سینگ هیٚلانەی رازت بیٚ.

6 ـ ساوا نەگری شیری نادریٚتیٚ.

7 ـ شیرین گفتارو روخوٚش دوٚستی‌زوٚرە.

8 ـ سوڕانەوەی جیهان زوٚرکوٚنە ناگوٚریٚ بەڵام چەرخی بەختمان ئەگوٚریٚ.

[ص - ط]

1 ـ صەد چاکەبکە پاداشتێك بەشت بێ دیسان هەرکارە.

2 ـ سڕبوونی پێ و دەست بانگی مردن ئەکات.

3 ـ تاقی بەهەشت نابینی ئەگەر سێ کوڕودوکچ بەخێو نەکەی.

4 ـ طارمەی خانوت بناغەی بەتین نەبێ ئەڕوخێ.

[غ، ف، ق]

1 ـ غرندەی پڵنگ شێر ناترسێنێ.

2 ـ غونچەی خانمانت بەنارێکی بەدنام مەکە.

3 ـ فەرهەنگی زمانت شیرینت ئەکات.

4 ـ قاڵی و قاڵیچــە دوشین نات کاتــە سەردار ئەگــەرتــۆ بۆ سەرداری ئامادەنە بی.

5 ـ قسەکە بڵاو بوکۆ ناکرێتەوە.

[ل، گ، ل]

1 ـ گەورەی ڕاست پەرست لەقسەی راست توڕەنابێ.

2 ـ کێو بەکێو ناگات بەڵام خاکی [مردم ـ انسان] بەخاکی ئەگا.

3 ـ لەزەوی کوێران یەك چاو پادشایە.

4 ـ لەگیرفانی ئەهریمەن هەڵ ئەپەڕێ و لەتورەکەی جنۆکە سەمائەکا.

5 ـ کوێرلە هەتاو چی ئەزانێ.

6 ـ لەکۆنە پەرست دەست بشۆ.

7 ـ لە ناوکادا بۆدەرزی مەگەڕێ.

8 ـ کەوش درو هەرگیز کۆنە لەپێ ئەکا.

[و، هـ، ی]

1 ـ هەروەکو کۆتر زووئە گەڕێتەوە [پەوەفایە].

2 ـ هەمیشە پاسوخی [جوابی] گەوج بێ دەنگیە.

3 ـ هیواو هیمەت بەخۆت بێ دوایی بە خزم ودۆست و ئاشنا.

4 ـ هەرکەس دووڕوژی هەیە ڕۆژی بوون ڕۆژی چوون میان ئەم دوڕۆژە ڕێ بینە.

5 ـ وەڕینی سەگ بەهەور زیان نادا.

6 ـ یەك ڕەنگ بەنەوەکا ڕوزەردی بت گرێ.



هزار بێژ و پەند

کۆکردنەوەی

معروف جیاووك

نرخی (٣٠) فلسه

بغداد :- چاپ خانەی نجاح

١٩٣٨ م

١٣٥٧ هـ

# گەڕانەوەیەك بۆ نوێخوازی و هاوچەرخایەتی

جاربەجار، هێندی لەنووسەرو بوێژەکانمان کێشەی نوێخوازیو هاوچەرخایەتی لەسەر لاپەڕەی ڕۆژنامەو گۆڤارەکانی ئەدەبیدا دەخەنەڕووو بێ‌ئەوەی گەلێکیان ئەرکی توێژینەوەو لێکۆڵینەوەیەکی چالاکانە بخەنە ئەستۆی خۆیان، بۆ دەرخستنی مەبەسیان لەم نوێخوازی‌یەو پیشاندانی ئەو تایبەتیانەی کە ئەدەبی نوێو هاوچەرخ جیادەکاتەوە، تاوەکو نووسەرو بوێژەکان سوودی لێ‌وەربگرن. لەوانە هێندەك نموونەی ئەدەبی دەکەنە پێوەری ئەم نوێخوازی‌یە، نا لەبەر ئەوەی شتێکی نوێ‌ی دەخاتە سەر بزووتنەوەی ئەدەبی، بەڵکولەبەر هێندێ ڕوخساری تایبەتی کە لەگەڵ ئارەزوو و ڕێ‌ڕەوی فیکری‌و ئەدەبیان دەگونجێ. بۆنموونە هەیە جیمس جویس دەکاتە نموونەیەکی نوێخوازیو هاوچەرخایەتی لەبواری ڕۆمان نووسیندا، هەشە کارتێکراوی ڕێبازی (وجودیە)تەو بەرهەمەکانی سارترو ئەوانەی لەسەر ڕێبازی ئەو دەڕوون، دەکاتە ترۆپکەی هاوچەرخایەتی هەروەها هی‌واش هەن کارتێکراوی ئەدەبی ساموئیل پیکیت و ئەلبێرکاموون، ئەوانەی ڕابەری ئەدەبی عەبەسین ـ الأدب البعثي ـ لای ئێمەش وە بەدرێژایی ئەو سی‌ساڵەی ڕابووردوو لە گۆڕەپانی ئەدەبیدا، گوێمان لە گەلێ بانگ و هاواری هاوچەرخایەتی‌و نوێخوازی بووە، چاومان بە چەند نموونەیەکی ئەدەبی کەوتووە کە داچۆڕانی مل ملانێ‌ی ناکۆکیەکانی کۆمەڵایەتی بووە، لە قۆناغێکی دیارکراوی مێژوویی هاوچەرخمان، لەلایەکی دیکەشەوە کارتێکراوی ئەو ڕێبازە فکری‌و ئەدەبیانە بوون، کە لەپاش تەنگوچەڵەمەکانی ئابووری‌و سیاسیی خنکێنەری باو لە دەوڵەتە سەرمایەدارەکاندا، کە بە پلەیەکی بەرزتر پاش جەنگی جیهانی دووەم چەسپێندرا. ئەوەبوو بە ئەدەبی شەستەکان، یان نەوەی شەستەکان لە ئەدەبدا ناوبرا، کە ڕەنگدانەوەی ئەو بانگ و دیاردانە بوون.

دەمەتەقێ دەربارەی نوێخوازی جا چ لەبواری شیعردابێ یا چیرۆك و ڕۆمان، بابەتێکی تازە لەدایك بووی گۆڕەپانی ئەدەب و هونەر نییە، بەڵکو بەشێکی سروشتی‌یە لەو مل ملانێ‌یەی کە لە کۆمەڵگاکانی مرۆڤایەتیدا، لەنێوان کۆن و نوێ دەست پێدەکا. لەنێوان ڕابوردوو بەهەموو بیرو باوەڕو نرخە جوانەکانی‌و ئێستای بەرەو پێشەوەچوو و گۆڕاوو ڕانەوەستاو لەیەك شوێندا.

ئەمەش جێ‌ی سەرسوڕمان نییە، چونکە ڕوخساری چەرخی ئێستامان ئەم خێرا بەزینەیە لە بوارەکانی بەرەو پێشچوونی ژیاری.

. . ئەم ژیاری‌یەی کە لەسەرەنجامی کۆبوونەوەی کۆمەڵێکی زۆری زانیاری‌و تاقیکردنەوەیەکی دوروودرێژی مێژوویی پەیدابووەو ئادەمیزاد بە هونەرو بلیمەتی خۆی دایمەزراندووە.

. . ئەم دەمەتەقێ‌یە بەشێکی ئەم دەمەتەقێ‌یە بەرفرەوانەیە کە لەگشت جیهاندا بەردەوامەو ڕۆژنامەو گۆڤارەکانی جیهانی شتێکی زۆری لەسەر دەنووسن و تەواوکەری ئەو دەمەتەقێ‌یە مێژوویەیە کە هەر لە سەردەمی ئەغریقەکانەوە تا دەگاتە بەرەبەیانی سەرمایەداری کە لە ئەنجامی بوژانەوەیدا بزووتنەوەی ڕومانسیەت پەیدابوو و بەرامبەری کلاسیزمیەت وەستاو لەگەڵی کەوتە زۆرانبازی ،ئینجا پاش ئەوە ڕیالیزمی شۆڕشگێری‌و ڕیالیزمی سۆشیالیزمی هاتەکایەوە، کە بنچینەی ئەدەب و هونەرێکی تازە بابەت و ئامانج و تازەفۆرمی پەیداکرد.

دەتوانین ئەوە دووپات بکەینەوە کە دەرگای ئەم دەمەتەقێ‌یە لەدوارۆژیشدا هەر واڵا دەمێنێتەوە، چونکی

مرۆڤـایـەتی هەر بەردەوام دەبێ لەڕێڕەوە ژیـاریـیەکـەیو بابـەتـەکـانی نوێخـوازیو هاوچـەرخـایەتی بەو پێشکەوتنە بەردەوامـەی ژیـانی کۆمـەڵایـەتیـەوە بەند دەبێ، کە پاڵ بە وێـژەرانی دوارۆژەوە دەنێو دەیـانخـاتـە دەریای تاقیکردنەوە تازەکـانیـان، کە تەعبیر لە پێویستیەکانی چەرخەکەیان بکاو بگـونجێ لەگـەڵ ئەو گۆڕانکـاریو پێشکـەوتنـەی لە پلەی هۆشمەندیو رۆشنبیریو رەوشتی مرۆڤ دا روودەدا.

ئەوەی دەبێتـە هۆی نوێخـوازی چییـە؟. ئایا ئەکرا ئەو شاکـارە وێـژەییـانـەی چەرخی ئێستـامـان، لە چەرخەکانی ناوەراست دا پەیدا ببوایە؟.. ئایا بلیمەت داری لە خۆڕا پەیـدا دەبێ یابـەنـدە بە بەرەو پێیشـەوە چوونی کۆمـەڵگـاو رووداوەکانی مێژوویی؟!.

هەمـوو ئەو رێبـازە فیکـریو ئەدەبیو هونـەریانەی کە بە درێـژاییی مێـژوودا بەدەرکـەوتن، رەنـگ دانەوەی ئەو بەرەو پێـشـەوەچـوونـانـە بوو کە لە بواری ماددیو شێـوەی بەرهـەم هێنـانی کۆمـەڵایەتی رووی دەدا.. دەنگ دانەوەی پێشکـەوتنی بیـرو هۆش و کۆبـوونەوەی رۆشنبیریو زانیاری مرۆڤ بوو، لەئـەنجـامـدا تەواوکـەری ئەو زۆرانبـازییـە سەختەی مرۆڤ بوو دژی خۆیو دژی سروشتیش. ئەم کارە نوێخـوازەیـە کە لەچـوارچێوەی ژیانی ماددیو کۆمەڵایەتی رووی‌دا بارێکی تازەی هێنایە کایەوەو دەرفەتێکی گونجاوی خولقـانـد بۆ دروستکـردنی شێـوەیەکی نوێی رۆشنبیریو هۆشمـەنـدی کۆمـەڵایـەتی، کە ئەدەب و هونـەر پلەیـەکی بەرزی ئەم بارەیە.

لەو چەرخـە دێـرینـانـەی کە بەسەر عیراقدا تێپەڕی، لە سەردەمی سۆمـەریو ئەکـەدیو بابلیـەکـانـدا، لەو کاتـەی دارجـووت ئامیـری بەرهـەم هێنـان بوو، بەرهـەم هێنـانی کشتـوکـاڵیو پیشەیی، بنچینەی ژیانی ئابوری بوو، لەژێر سێبەری ئەم هەمەجۆرە هۆشمەندییە کۆمەڵایەتیەکانیدا کە ئەوسـاکـە باوبـوو، ئەدەب و هونـەر رەنـگ دانـەوەی ئەو بارانەبووو لەگەڵیشی دەگونجا. بەئاسانی دەتوانین ئەمە لە دەقـە ئەدەبیـەکـانی پاشماوەی ژیارەکانی رابوردوودا بە دی بکەین، وەکو داستانی ـ گلگامیش ـ و گەلێ دەقیتر.

اسماعیل رسول

هەر لەبـەر ئەوەی بەرەوپێشچـوونی مێـژوویی گەلێ سست رەویـوو، شێـوەی بەرهـەم هێنـان تا ماوەیـەکی دوورودرێـژ، هەروەکـو خۆی مایـەوە، بۆیـە شێـوەو جۆری هۆشمـەنـدی مرۆڤ بە زۆری نەکـەوتـە بەر گۆڕیـن و پێشکـەوتن و بۆیـەش کەلـەپـوورو وێـژەی میللی هەر سەرچـاوەی بنـەڕەتیو روخسـاری دیاریکراوی تا ماوەیەکی دووریش پاش دۆزینەوەی نووسین مایەوە.

شیعـر لای عەرەبـەکـانی پێش ئیسـلامـەتی، جۆری بنـەڕەتـی ئەدەب بوو، بابـەت و ئامـانجـەکـانـی ئەم شیعرانەش، رەنگ دانەوەی ژیانی ئابوریو کۆمەڵایەتی ئەو سەردەمەبوو. بەڵام کە ئایینی ئیسلام هەر وەك شۆڕشێکی بە تەوژمی کۆمـەڵایـەتیو کە بیـروبـاوەڕێکی ئایینیی نوێ خۆیچـەسپـاند، جۆری بیرو هۆشمەندی خەڵکی گۆڕی، لە دواییدا ئەدەب بەبابەت و شێوەو ئامانج و ئاسۆکانی گۆڕاو بەرەوپێشەوە چوو. بێگومان دەمەتەقێی نێوان کۆن و نوێ بە پێوەری ئەو سەردەمە دیسان هاتەکایەوە.

.. ئـەغـریقـەکـان بنچینـەی ژیـارێکی دێرین و بالایان دامـەزرانـد کە لە سەریـدا بیـرو هۆشێکی پێشکـەوتـوویان درووست کردو بۆ ئەدەب و هونـەریش بنـاغـەیەکی پتەویان دانـا، تا ئەو رادەیـەی ئەوروپـاییـەکـان تا کۆتـایی سەدەنـاوەنـدیەکان لاساییان دەکردەوە. بەڵام ئەوەی کلپەی ئاگاری ئەو بەربەرەکانیەی نێوان کۆن و نوێی خۆش کرد، ئەو گۆڕانکـاریـانـە بوو کە لەبنـاغـە ئابـوریـەکانی کۆمەڵگا ئەوروپـاییـەکـانـدا رووی دا، گۆڕینی شێـوەکـانی بەرهـەم هێنـانی پیشـەیی بچـووك و کۆبوونەوەی سەرمایەی بازرگانیو دۆزینەوەکانی جیوگرافی، بوونە هۆی پەیدابوونی شێـوەیـەکی نوێی بەرهـەم هێنـانی سەرمـایەداری، کە بە هەنگـاوی خێـرا بەرەو پێشـەوە چوو. لەئـەنجـامی ئەوەشدا کۆمـەڵگـائـەکلیـرکیو دەرەبـەگـایـەتیەکان لە رەگ و ریشەوە

دەرکێشران، بەتەیا بناغە ئابوریەکانیان نەرمێندرا، بەڵکو گشت پێوەرە کۆمەڵایەتی و رۆشنبیریەکانی روخێندران.

رۆمانسییەت رەنگ دانەوەی شێوەی بیرو هۆشمەندی یەکانی تازەبوون، گۆرینێك بوو لەناوەرۆك و فۆرمی ئەدەبدا، رێرەوێك بوو بەرەو کێشەو گیروگرفتەکان و خەم و پەژارەی تاقەکەس و وەسفی سروشت و فرین بە ئاسۆی ئەندێشەدا، خۆنەبەستنەوە بوو بەفۆرم و شێوە کۆنە کلاسیزمەکەی ئەدەب، بە شیعرو چیرۆك و رۆمان و شانۆگەریەوە.

لەدوو سەدەکەی رابوردوودا، سەدەی هەژدەهەم و نوزدەهەم کە سەردەمی بەرەوپێشچوونیکی سەرسورێنەری ژیاریکی ماددیو کۆمەلایەتی و فیکریبوو، لەژێر سێبەری رنجیرە دەسکەوتەکانی زانیاری لە هەموو بواریکدا، ئەوەبوو مل ملانێی فیکری کە رەنگدانەوەی ئەو گۆرانکاری یەی شێوەی بەرهەم هێنانی کۆمەلایەتی بوو، دەستیپیکرد، چونکە لە ئەنجامی ئەو گۆرانکاریانەدا چینێکی نوێ پەیدابوو کە توانی دەست بەر کۆمەڵگادا بگرێو ببێتە جێگری چینەزاڵەکانی لەناوبراوو گشت سەروەت و سامانی کۆمەڵگا بخاتە ژێر دەستی خۆی . بەرامبەر ئەم چینەش کە چینی سەرمایەدارە، چینە هەژارو چەوساوەکانی تازە پەیدا بوو، لە کرێکارو جووتیارو کاسب و پیشەسازە بچوکەکان . .

لێرەدا بەربەرەکانی دەستیپێکرد، ئەم بەربەرەکانیەش هەر لە چوارچێوەی ئابوریدا نەمایەوە، بەڵکو بووە بەربەرەکانیەکی کۆمەلایەتی بەرفرەوان . . بەربەرەکانی لەنێوان دوو ژیاری ناکۆك لەگەڵ یەکتردا، بەبیرو باوەرو نرخە کۆمەلایەتی و فیکریو رۆشنبیریەکانیان، لە چوارچێوەی یەك کۆمەڵگادا.

خۆ گواستنەوەی سەرمایەداری بۆ سەردەمی کولونیالیزم و ئیمپریالیزمی تازە، هاندەرێك بوو، بۆ پەیدابوونی رێرەوێکی رۆشنبیری نوێو ئەدەب و هونەرێکی تازە، کەرەنگدانەوەی ئەم بارە تازەیەبوو. ئەم رێبازە ئەدەبییەی کە بەریالیزم و ریالیزمی شۆڕشگێر ناسرا، داوای ئەدەبێکی لایەنگری کێشەکانی مرۆڤ دەکاو دەربری خەم و پەژارەو گیروگرفتە کۆمەلایەتی یەکانی هەمەجۆرەو بووەتە شێوەیەکی بیرو هۆشمەندی کۆمەلایەتی کە رەنگدانەوەی بارە مل ملانی گشتیبەکەیە ،بەلام ئەم رێبازە لە هەر ولاتێکدا شێوەیەکی تایبەتی خۆی وەردەگرێ بەپێی تایبەتیە نەتەوایەتی و کۆمەلایەتیەکانی.

ئەدیبانی رووس لە پێشەنگی رێبازی ریالیزمدا دەرۆیشتن چەندین شاکاری ئەدەبی مەزنییان داهێنا، وەکو (جەنگ و ئاشتی) و(ئاناکارنینا)ی تولستۆیو (تاوان وسزا) و (براکارامازوف) یەکانی دیستوفسکیو گەلێ لە بەرهەمەکانی چیخوف و گوگول و پوشکین و لیرفتوف و غورکیو دەیانیتری وەکو ئەوان.

هەروها لە فەرەنگستان دا (بلزاك و هوگۆو) لەولاتە ئاوراپایەکانی دیکەش، گەلێ نووسەرو ئەدیبی مەزنی ئەم رێبازە وەدەرکەوتن و رۆڵێکی مەزنیان لەبواری ئەدەبدا گیراو گەلێ بەرهەمی شاکاریان خستە سەر کەلەپووری ئەدەبی جیهانی جا نووسەرە ریالیزمەکانی نەوەی پاش ئەوانییش لەسەر هەمان رێباز رۆیشتن. بەلام، لەبەر ئەوەی ژیان وەکو روبارێکی بە تەوژم وایەو لەیەك جێگادا راناوەستێ بۆیێ شتێکی سروشتییە کە نوێخوازیو هاوچەرخایەتی، لە شێوە ئەدەبیەکاندا هەر بەردەوام بێ، رێبازو رێرەوی هەمە جۆریش پەیدا ببێ، کە دەبنە نوێنەری چین و توێژاڵە هەمەجۆرەکانی کۆمەڵگاو دەربری بیرو هوشمەندی جۆراو جۆری کۆمەلایەتیو رۆشنبرین. مەرجیش نییە پەیدابوونی رێبازێك یەکسەر ببێتە هۆی نەمانی رێبازو قوتابخانە وێژەییەکانی دیکە، بەڵکو لەیەك کۆمەڵگادا گەلە جۆری رێبازە ئەوەیو فیکریەکان بەدی دەکەین، ئەوەش دیسان بارێکی ئاساییو سروشتییە. بەلام بۆمان هەیە بپرسین ،ئەم رێبازانە کامیان نوێنەری هاوچەرخایەتین؟. کامیان نۆی راستەقینەن بۆ سەرهەڵدانی رێبازەکانی دوارۆژ و کە لەوانەیە ببنە دەنگ دانەوەی

گۆرانکاری‌یە راستەقینەکانی کۆمەڵگاکانی دوارۆژ؟ گومان لەوەدا نییە ،ئەو ئەدەبەی کە بەهاوچەرخایەتی ناو دەبردرێ ،پێویستە لە خەم و پەژارەو ئاواتەکانی مرۆڤانی هاوچەرخی خۆی بدوێ‌و ئاوێنەیەکی بێگەردبێ، وێنەی جوڵانەوەی کۆمەڵگاو ناکۆکیەکانی‌و مل ملانێ، بە روونی دیاربکا. بەواتایەکی‌تر ،ئەم ئەدەبە لەبارەکانی ئەو کۆمەڵگایەی هەڵدەقوڵێ، جیاواز ناکرێتەوەو هەر دەبێ دەنگ دانەوەی دەروونە بەئێش و ئازارەکەو یاکەیف خۆشەکە بێ کە لەگەڵ ئاستی هۆشمەندی کۆمەڵایەتی (الوعی الأجتماعی)و پلەی رۆشنبیری گشتی‌دا بگونجێ.

ئەدەبی هاوچەرخ وەکو میکروسکوب وایە بە ئەرکی قەبە کردنی وێنە کۆمەڵایەتی‌و مرۆڤایەتیەکانی ئەو سەردەمە هەڵدەستێ لە چوارچێوەی پەیوەندی‌یە تێکهەڵکێشراوەکانی قۆناغی ئێستاماندا بە هەمو نرخە فیکری‌و کۆمەڵایەتی‌و ئابوریەکانیەوە.

ئەم نموونانەی ئەم رێبازە پەیرەو دەکەن، ئەدەبی هاوچەرخن جا بە هەرچی پلەیەك بێ‌و بەپێی هونەرمەندی نووسەرو بەهرەوتوانای لە دەرهێنانی دیمەن و وێنە کۆمەڵایەتی‌و مرۆڤایەتیەکانی، کە ناوەرۆکی بەرهەمە ئەدەبیەکانن.

بەڵام نوێ‌خوازی چەمکێکە لە واتاو چەمکی هاوچەرخایەتی تێپەر دەبێ ،هەرچەندە پەیوەندیەکی توندو تۆڵ پێکەوەیان دەبەستێ چونکە مەرج نییە هەر نموونەیەکی ئەدەبی‌ی هاوچەرخ نوێ‌خوازی تێدابێ، ئەگەرچی مەرجە نوێ‌خوازی گشت لایەنەکانی هاوچەرخایەتی پێوەبێ.

باری نوێ‌خوازی هەر بابەت یا ناوەرۆکەکانی بەرهەمە ئەدەبیەکان ناگرێتەوە، بەڵکو سەرەرای ئەوە بایەخێکی زۆر بەفۆرمی یاخود بەم چوارچێوە هونەریە دەدا کە ناوەرۆکەکە دەگرێتەبەر. چوارچێوەی هونەری نوێ لەسەرەنجامی گۆرین و بەرەو پێشەوە چوون پەیدا دەبێ، دەربرینێکی پێویستیەکانی کۆمەڵایەتی‌و فیکری‌یە، ئینجا لەدوای ئەوەدا رۆشنبیری‌و ئەدەبی، چونکی فۆرمە هونەریەکانی کۆن ناتوانێ شاڵاوی رێژنە بابەتەکان بگرێتە بەرە خۆی، کە پێویستیەکانی پێشکەوتنی ئابوری‌و کۆمەڵایەتی‌و باری بیرو هۆشمەندی پەیدای دەکا بۆیە پێویستی وا دەکا شێوەو فۆرمەکانی تازە بابەت بەدەربکەوێ کە بگونجێ لەگەڵ ئەم بارە نوێ‌یە وە ئەگەر هاتو سەرنجمان دایە ئەم بەرەوپێشچوونە مێژوویەی کە بەسەر شێوەی بەرهەمە ئەدەبیەکان و چوارچێوە هونەریەکانی‌دا داهاتووە، بەروون و ئاشکرا ئەمە تێبین دەکەین.

جا ئەدەب لە گۆرانی پەرستگاکان و هەڵپەرکێ لای لایی‌ی دایکان و حیکایەتی میللی‌و ئەفسانەوە دەستی پێکردو بەرەوپێشەوە چوو تا گەیشتە شیعرو چیرۆکی هونەری‌و رۆمان و شانۆگەری .. هتد بەڵام جیاوازیەکی گەورە دەبینین لەنێوان ئەو نوێ خوازیەی کە لەسەر بناغەیەکی هونەری روون دەچەسپێ‌و لەنێو ئەدیب و رۆشنبیران پەسند دەکرێ، خاوەنی روخسارێکی‌تایبەتی‌و دیاری‌کراوەو لەگەڵ حاڵەتی ئەو تاقیکردنەوەیەی هێندەك کەس پێی‌ی هەڵدەستن و کە هیچ پەیوەندیەکی بە پێویستیەکانی بەرەو پێشەوە چوون نییە. جا بۆیە هەمو بابەتێکی نوێ، حاڵەتێکی نوێ‌خوازی پێشکەوتوو سەرکەوتو نییە.

بەڵام تاقیکردنەوەی هوشیارانە لەوانەیە ببێتە هۆی درووست بوونی بابەتێکی شێوە تازەی هونەری ،کە خواستەکانی چەرخ دابین دەکا لێرەدا کەسانی داهێنەرو بلیمەت دار رۆڵی مێژوویی خۆیان دەگێرن کە هاوچەرخایەتی لە رابوردوو تێگەیشتنی باری ئێستاماندا وەردەگرن و بابەتە نوێ‌یەکان وەدی دێنن، وەیا بەشداری لەبەرەوپێشدانی شێوە نوێ‌و باوەکانی سەردەمی خۆیان دەکەن.

بویە بەرهەمە داهێنەرو جوانکاریەکانیان گەلێ جۆری نوێ‌خوازی تیدایە، جاچ لە هەڵبژاردنی بابەتەکانی بێ یا لە گرتنی ئەو وێنە زیندوانەی ژیانی مرۆڤ، کە بلیمەتانە دەیکەنە کەرەستەی سازکاری‌یەکی هونەری باڵاو دەبێتە جێی‌ی رەزامەندی‌و رێز لێنانی خەڵکی لەوانەشە ئەم بەرهەمانە ببنە بنچینەی رێبازێکی نوێ‌خوازی کە هی دیکەش بەدرێژایی رۆژگار بەشداری لەبەرەو پێشدانی دەکەن و تاشێوەیەکی پێگەیشتو و وەردەگرێ‌و کەسانی‌تر بەرەو خۆیەوە رادەکیشێ‌و لەئەنجامدا دەبێتە بناغەی ئەو رێبازە نوێ‌خوازانەی دوارۆژ.

# پـــرۆژەی

# دیوانی سەیفی قازی

لە ژمارە (4)ی گۆڤاری (کوردستان)ی ساڵی (1946)دا کە زەمانحاڵی حیزبی دیموکراتی کوردستان بوو، لە ڕۆژانی کۆماری جوانەمەرگی مەهابادی خوێنینی کوردیش، دەرئەچوو. نووسەرێکی هێژا بەناوی (سید محمد حمیدی) یەوە، کوتارێکی بەنرخی بەناوی (شاعیری میللی بەناوبانگ، حەزرەتی ابوالحسن سیف القاضی ـ بەهۆی (72) مین ساڵی لەدایکبوونی، لەگەڵ شەش پارچەی دەگمەن و گرانبەهای لە شیعرەکانی ئەم شاعیرە نەمرەی بڵاوکردوتەوە.

جارێ با لەپێشدا بەوردی ئەو وتارە بایەخدارە (بخوێنینەوە، کە لەو ژمارە (4)ی باسمان کرد بڵاوکراوەتەوە. . ئینجا یەکە یەکە بەناخی شیعرەکاندا شۆڕبینەوە، تا بە ڕاشکاوی جێگەو پایەو شاعیرایەتی سەیفی شەهیدو شۆڕشگێرمان بۆ ڕوون بێتەوە. . .

★ ★ ★

«یەکێ لە زیانی هەرەزلی ئەو چەرخی دواییەی زانست و ئەدەب بەتایبەتی ئەدەبیاتی کوردی، لەدەست چوونی هونەرێکی بڵندپایەو بەرز، حەزرەتی (ابوالحسن سەیفی قاضی)یە کە نێو بانگی بە (سیف القضات) ڕۆیشتووە. . ئەم ڕۆژی ڕووناکی ئەدەبیاتە کەلە کەناری ئاسمانی کوردستانی ڕۆژهەڵات دەرەوشیو ەو هەڵاتووەو بەنوری دانش و زانستی خۆی، عالەمی شیعرو ئەدەبیاتی ڕووناك کردوە، نەتەنیا مایەی سەربەرزی‌و شانازیی کوردستانی موکریانە، بەڵکو بەبۆنەی ڕۆڵەیێکی‌وا، کە دایکی گێتی لەپەیداکردنی وێنەی ویدا ڕژدی دەکا، بۆوەی دەبێ کە هەموو کوردستانی گەورە پێی بنازێ.

ڕووناکی دڵ و لەتافەتی تەبع ووردی مەعناو زێبایی ئەلفازو وتار، دەگەڵ تیژی زیهن و زیرەکی‌و هەستی نەوعپەرستی‌و بەرزی گیان و ئەخلاق، سیف القضاتی لەنێو زانایان و گەورە گەورانی زەمانی خۆیدا بێ وێنە کردبوو.

سەبك و شێوەی سەیف زۆر مامۆستایانەو دەگەڵ جوانتر کەلام بەرامبەری دەکرد، ئەشعاری دڵرفێنی‌و ئاوداری وی، دەگەڵ مەزامینی نوێ‌و سوودمەند لە ئیستیحکامدا، وەك پۆڵاو لە ڕەوانیدا وەك ئاو وایە، بەتایبەتی ئەشعاری دڵچەسپ و میللیەکانی، کەمایەی وریابوونەوەی کۆمەڵ و هوشیاربوونەوەی کوردە.

(ابوالحسن سیف القاضی) کوری میرزا أبوالقاسم قاضی‌یە، لەهەشتەمی مانگی بانەمەڕ (اردیبهشت ـ 1255)ی شەمسی، بەرامبەری چوارەمی (ربیع الثانی ـ 1293)ی قەمەری [ڕێککەوتی ساڵی ـ 1876 ـ زایینی] (م. ز) لەشاری

نیشتمانپەروەرانی وەکول دینا.. پیاوێکی زیرەك و تێگەیشتوو زاناو نیشتمانپەروەربوو، لەکن هەموو سنفێك موحتەرەم و خۆشەویست تەماشا دەکرا. تەمەنی تەواوی خۆی بەشەرافەت و نیشتمانپەرستی رابواردو تا رۆژاوای حەوتەمی رێبەندان (بهمن - 1322)ی شەمسی، موتابیقی (12 - صفر)ی (1364)ی قەمەری [رێککەوتی - 1943 زایینی - م. ز] لەتەمەنی حەفتاسالێدا دنیای ویداع کردو کەس وکارو نیشتمانپەروەرەکانی بەیەکجاری خەمناك کرد

★ ★ ★

کوردینە، تاکەی ئێمە لەشاخان میسالی دێو
بێن وبچین بۆمە نەبێ قەت خودان وخێو
خەڵکی هەموو لەباخ و لەشارانا کەیفخۆش
ئێمە بڵاوبێ سەرەماوین لە دەشت و **کێو**
بۆوانە هەرچی جوانە، لەجێ، دێ، لەژن، زلەماڵ
هەر شاخ و داخە بۆمە، کوری رەش، کچی **دزێو**
بۆ ئاسمان دەرۆن و لەبەحرا دەکەن سەفەر
هەر عەرزە نیشتگاهیمە، سەنعاتە وردوشێو
رەشماڵە ماڵ و کەشك و پەنیرە مەتاعیمە
قەسرو سەرای خەڵکی دیە، پر لەزێرو زێو
سەرچوونی تەخت رۆینی سەرداری پێدەوێ
خۆشیمە لەو شەهادەتی **شێخانە نێو بە نێو**
فیکرێ لەحاڵی خۆکەن و بیگرین بە حاڵی خۆ
شاهان بە مەحووی ئێمە دەبەستن گرێو گرێو
تاکەی لەباخی خەڵکی، **بەزیزیو بە ملکەچی**
خۆشە لەباخی عێلی، چنینی هەنارو **سێو**
هەرچی دەبێ بلایێ حەق هەر حەقە (حەسەن)
نینە لە رێی وەتەن، خەمی دەرکردن و جنێو [1]

★ ★ ★

- محمود زامدار -

**مهاباد** لەدایك بووە.. ئەم زاتە لە بنەماڵەی قازیەو ئەوەندەی ئێمە دەزانین ئەم خانەوادە لەمهابادێدا چەن چەرخێکە نێو بەدەرەوەو جێگای رێکخستن و پێکهێنانی ئومووری قەزائیو عورفیو بەڵکو بەهێزی باسك و ئەسلەحەراگری حقووقی خەڵکی، بەتایبەتی دانیشتوانی مهاباد بوون و کاریان هەر لە قەزاوەت بووە، گەلێجار وابووە کەلەلایەن عەشایری دەوروبەر، یا حکومەتی هەندەران لەمهاباد هەرەشەکراوە، وەلێ ئەم خانەوادە هەنگاوی پیاوەتیان هەڵێناوەو مهابادیان لەپەلاماری دوژمنەکان پەناداوە.

مەرحوومی سەیف لە خزمەت مەلا شفیع و مەلا حەسەنی کوری قزڵجیو مەلا صالحی سەر، دەرایاتێ علوومی مەعقوول و مەنقوولی خوێندوەو پاش تەواوبوونی خوێندن بەقەزاوەت خەریك دەبوو، زۆروستەم و بلەوەزەکانی دەگەڵ نەتەوەی کوردا بەچاوی خۆی دیوەو لەجەرگ **و هەناویکار** کردوە، جادلی کۆلیوەو **بێ**خاوەن و پەرێشانیو بڵاویەتیو، سەرکزیو هەژاری کوردەکانی لە ئەشعاری میللی خۆیدا نواندوە.

سەیف القوزات، لە کوتنی ئەشعاری کوردیو فارسیدا، زۆر ماهیر بووە، بەتینی ئەشعاری میللی خۆی دڵی

عەزیز ئارەزووت زۆری بۆ هێنام
فرمێسکم سووربوون زەردی رووی لێنام
دیسان بە ئاوری دوریت کەوتمە گیر
دنیام لێ ساردبوو بوو بە زەمهەریر
دنیا وا پڕ بوو لە بەفروسیخوار
فرمێسکی سوورم بەسپی دێتە خوار
تا ناهومێد بووم لەهاتنی زووت
جەرگم بووە پوڵوو هەناسەم بزووت
هەوا بە حاڵم وەك کێوان دەگری
بەتەرزەو بەفرو بارانی هەوری
عەرزیش لە بۆمن هێندەی قوڕپێوا
بەهاری دەگەڵ زستان لێشێوا
گیاو گوڵی مێرگان بۆم سیس و زەردبوون
بۆشینی کێوان کەوان هەمدەردبوون
شینی بەهارە عاسمان هەر دەگری
هەوریش ناڵەناڵ رووی خۆی دەپچڕی
(با) لەکێوو دەشت خۆڵ وەسەر دەکا
گریانی کێوان بەحران پڕ دەکا
داری مێشەو باغ بەفر دایپۆشین
پاك دەڵێی مردوون کفنیان پۆشین
کەوی کوێستانان لە قاسپەکەوتن
بێهۆش بوون یاخۆ خەویان لێکەوتن
چیرەو زریوەی چوڕەو چۆلەکە
نایێ نەیانما هێلانەو هێلکە
لەگەڵەگ لەگەڵ کەوت نەما تەقتەقی
سێرۆش لە سیرەوفیت و چەقچەقی
پاك پەشیمانن لە بۆ گەرمێنی
بۆچ دەهاتنەوە عەمروو نەمێنی
قاز لەشەتاوان قارەی لێبرا
دورنای چۆماوان زۆرنای لێدرا
لە درزی عەرزی هەوێردە دامان
بێهۆش بوونەوە سڕبوون لە سەرمان
لەسەرمان سەریان کێسەڵ وڕەقە
بردە بەر خۆیان بێ تەقەوڕەقە
وشك بوو دوپشك ئەو کوێری ناڕاست
مشك کونی خۆی بە ئاوات دەخواست
بۆق کە دیقیڕاند دەوی کردەوە
کەریش زەڕینی لەبیر بردەوە
مار پاپۆکەی خوارد خۆی دەخۆڵ دەگرت
توێژی کۆنەو نووی دەبەرخۆی دەکرد
ڕێوی کەوڵی خۆی ئاوەژوو دەکرد
ژیشك ئارەزووی کەوڵی مووی دەکرد
لاڵ بم نابینم لەچیاو لە ڕازان
زیڕەی هەڵۆیان چریکەی بازان
لەبن بەردانمان هەر سەر مازەڵە
لەباغ و باغچان قەل و قشقەڵە
پۆشی دایپۆشی داڵدەی پاك بڕی
کەروێشکێش ریشەی پاك کردو بڕی
بەفری بێوەعدە رەشانگی بڕی
رەشانگ و سپی پاکیان سەربڕی
سەربڕا گاشین پاش مانگا بۆرە
لەباتی گاران رۆیی گابۆرە
شین و گابۆرە لەنێو رەعیەتی
بەباچوو رەنج و سەعیو زەحمەتی
رۆژ هەتا شەوێ گەورەو بچووکیان
خێزانی ماڵی گەورە، کچ و بووکیان
خەریکن لەباغ فریزو دەردێنن
وەك شەونمی گوڵ ئارەق دەرژێنن
ئارەق لە هەنیان بەریز بژمێرە
کێ دی لە عاسمان بە رۆژ ئەستێرە

لەرووسیادا هەڵبژێرێ. گەرچی وڵاتەکەی ئەم بیگانە فەرمانڕەوایی تیا ناکات وەکو بولگاریا، بەڵام بەورەیەکی بۆلاینەوە پێویستی بەڕووبەڕووبونەوەی کێشەو گیروگرفت و کەم و کوڕییەکانیەتی تا لەڕووی کۆمەڵایەتییەوە سەرفراز بێت. لەبارەی رۆمانی «لەبەرەبەیاندا» ئەڵێ: «چاوەڕوانیمان بۆ ئەو رۆژە درێژە ناکێشێت. ئەو پەرۆشیو شەیدایییەی لەچاوەڕوانی ئەو رۆژەدا ئەیچێژێت، زامنی دەرکەوتنی - ئەو رۆژە - ئەکات لەژیانماندا. بەبێ ئەو بەرەبەیانە سەرکەوتن وەدەست ناهێنین. هەموو رۆژێکیش لەخۆیدا هیچ ناگەیەنێت جگەلەوەی بەرەبەیانی رۆژێکی دیکەیە. پاشدان، ئایا ئەو رۆژە دێت؟ هەرچۆنێك بێت بەرەبەیان لەرۆژی داهاتوو بەدوور نیە: تەنیا یەك شەو لێکیان ئەکاتەوە..!».

دۆبرالۆیۆف لەم وتارەیدا سیمای گشتی بەرهەمە هونەرییەکانی تورگینیڤی دییەوە کەلەوەرگرتنی بیری نوێو تازەپێگەیشتوودا خۆی ئەنوێنێو لەژیانی کۆمەڵایەتی دا دەرئەکەوێت بەڵام هێشتا بەتەواوی خۆی ئاشکرا نەکردووە. کاتێ تورگینیڤ مامەڵە لەگەڵ دیاردەیەکدا ئەکات پاش ماوەیەکی دی بەڕوونی لەواقیعی رووسی دا پێ ئەگات «چونکە بەدرێژایی ژیانی ئەدەبی پەیوەندییەکی زیندوو و لەیەك نەپساوی بەچاخەکەیەوە هەبووە»و وێنەی هەموو پاڵەوان و شۆڕشگێڕان و میللییەکانی کێشاوە، چونکە خاوەنی زەینێکی روون و وردی کۆمەڵایەتییە لەوەرگرتنی بیری نوێو نوێنەرەکانی لەنەوەی تازەپێگەیشتوو.

رەخنەگر لەوتاری «وڵاتی تاریکی»دا پێی وایەکە ئوستروڤسکیی شانۆنووس بۆتە قوربانی ئەو وتووێژ و مشت و مڕەو نێوان پەیڕەوکەرانی رێبازی رۆژئاوایی بۆ گەشەپێکردنی رووسیا لەگەڵ پەیڕەوکەرانی رەوتی سلاڤی. ئەم دوو لایەنە ئاماژەی ئەوە ئەکەن کە ئوستروڤسکی یەکێك لەم رێڕەوانەی هەڵبژاردووە. ئەمەیش پێچەوانەی واقیعە. هەروا یەکێك لە رەخنەگران پێی وایە وتاری «وڵاتی تاریکایی» کورتەتایەکە لە هۆشمەندیی کۆمەڵایەتیو ئاقارێکیشە بەرەو رێبازی نوێی مەفاهیمەکان».

لە «تیرێژێك لەوڵاتی تاریکییەوە» رەخنە لەو رێسا سەقامگیرانە ئەگرێ کە رەخنەگر لێیانەوە ئەدەب هەڵئەسەنگێنێو کاری ئەدەبی ئەخاتە قاڵبێکی دیاریکراوەوە وەك ئەوەی لەکتێبی قووتابخانەکاندا ئەکرێ. لەهەمان کاتدا رەخنە لە پەیڕەوکەرانی تیۆری هونەری تەواو «الفن الخالص» ئەگرێت و لەسەرووی هەمووشیانەوە درۆگینین، چونکە بڕوایان بەوە نیە ئەدیب لەگەڵ کێشەو گیروگرفتە کۆمەڵایەتییەکاندا بژیو پێیان وایە پێویستە لەسەری خۆی باوێتە نێو دنیای بەهرەو جوانییەوە.

لەسەر رەخنەگر پێویستە لەمیانەی دەقە ئەدەبییەکە خۆیەوە حوکم بەسەر ئەدیب دا بدات و لەخاسیەت و سروشتی ئەو دەقە بکۆڵێتەوەو بیروڕای خۆیشی بەسەردا نەسەپێنێ. لەم بارەوە ئەڵێ: «لەسەر رەخنەگری بەڕاستی پێویستە وەك چۆن ئەڕوانێتە رووالەتە واقیعیەکانی ژیان بەو جۆرەش بڕوانێتە بەرهەمەکانی هونەرمەند، لەسەریەتی هەوڵی دیاری کردنی یاسا خۆکارییەکان بدات و سیما جەوهەریو تایبەتییەکان وەدەرخات و ئاژاوە نەنێتەوە وەك ئەوەی بڵێت بۆچی (ئاڵف) مادەیەکی دیکەنیەو بۆچی رەژوو ئەڵماس نیە». هەر لەم سەرەتاگەیەوە دۆبرالۆیۆف خاسییەتە بنەڕەتییەکانی بەرهەمەکانی ئوستروڤسکیی دەست نیشان کردو لەدەرخستنی ئەو پەیوەندیە کۆمەڵایەتییە نائاساییەی نێو خەڵکیدا دۆزییەوە کەئەگەڕێتەوە بۆ ستەم و چەوساندنەوەی هەندێك بۆ هەندێکی دیکە. سەختیی هەلومەرجی گوزەران و ستەمکاریو بەرتەنگی ئەو کەش و هەوایەیان درووست کردووە کە کەسایەتییەکانی ئوستروڤسکیی تیا ئەجووڵێن و هەرلەویشەوە وێنەیەکی تەواوی وڵاتی تاریکایی هەڵئەهێنجین کە شانۆنووس مەبەستی لەسەر جەم رووسیایە.

بەڵام رەخنەگر لەشانوگەریی «زریان»دا گیانێکی نوێی دۆزییەوە کەداچۆڕانی تیریژێکە بۆ وڵاتی تاریکایی و ئەمەیش لەکەسێتیی کاترین ـ ی کچە پاڵەوانی شانوگەرییەکەدا خۆی ئەنوێنێ. ئەم کچە پاڵەوانە سەرباری ژیانە تراژیدیانەکەی، هەستی بەرزو باوەش گرتنەوە بۆ ژیانێکی باشتر بەرجەستە ئەکات، ئەمەیش سیفەتێکی نوێیە لەوڵاتی تاریکایی‌دا کەپێشتر نەبووە.

* * *

● د. ی. بیساروڤ (1840 ـ 1868) سەر بەخانەوادەیەکی رەسەنزادەیە، لەبەرئەوەی تووشی نەداری و مایەپووچی هاتبوون، ئەو ناچار بوو لەپاڵ خوێندن کاریش بکات. پاش تەواوکردنی زانکۆ لە گۆڤارەکان دامەزراو لەبارەی مەسەلەی خێزان و سەربەستی کەسایەتی و رزگارکردنی ئافرەت و بایەخدان بە جووتیاران و باشکردنی بارو گوزەرانیانەوە ئەینووسی. بەڵام ئەو کێشە کۆمەڵایەتییە توندوتیژەی لە ئەنجامی لەنێوبردنی رژێمی زەوی بەندیی (القنانة) لە رووسیادا سەری هەڵدا، وای لێ‌کرد چالاکانە هاوبەشی کێشە نیشتمانییەکان بکات و بەگژ رژێمی قەیسەری دام و دەزگاکانی‌دا ئەچوو و پێشبینی حەتمیەتی لەنێوچوونی ئەکرد. ئەم هەڵوێستەی تووشی زیندانی کرد، بۆماوەی پێنج ساڵ زیندانی قەڵای بیتروبافلۆڤسکی بەتەنهایی مایەوە. گەرچی تەمەنێکی کورت ژیا (لەساڵی 1868 دا خنکا) بەڵام کۆمەڵێ وتاری رەخنەیی بەنرخی جێ‌هێشتووە کەبایەخێکی تایبەتییان هەیە لەژیانی ئەدەبیدا.

لەسەرەتای ژیانی ئەدەبییدا لە روانگەی تیۆری «هونەر بۆ هونەر» کارە ئەدەبییەکانی هەڵئەسەنگاند، بەڵام ئەم تێروانینە ئایدیالیستانەیەی زۆری نەکێشا کە بڕوای بەفەلسەفەی ماتریالیزم هێنا لەلێکدانەوەی چالاکییە مرۆڤایەتییەکاندا. بەڵام هەڵسەنگاندنی بۆ بەرهەمە ئەدەبییەکان بەتێگەیشتنێکی ماتەریالیی بێزراوانەی هونەر وای لێ‌کرد لەنرخی هەندێ لە ئەدیبە گەورەکانی وەك پووشکین و سالتیکۆف ـ شیدرین و گانچاروڤ کەم بکاتەوە. هەروا لە هەندێك لە حوکمدانە ناکۆك و دژ بەیەکەکانی‌دا دەرئەکەوێت لەسەر کارە ئەدەبییەکان.

شێوازی ئەدەبی پۆشکینت بەچاك دائەنا بەڵام پێی وابوو نەیتوانیوە بیروباوەڕی پێشکەوتنخوازانە لەسەردەمەکەی خۆی‌دا رەنگ بداتەوە. ئەم بۆچوونە لای رەخنەگر بەشێوەیەکی تایبەتی قووڵتر بۆوە کاتێ پەیرەوکەرانی هونەر بۆ هونەر پۆشکینیان بەمامۆستاو نوێنەری خۆیان دانا.

شیکردنەوەکەی دۆبراۆبۆڤی لەمەڕ «زریان»دا پێ چاك نەبوو چونکە رەنگێکی شاعیریی داوەتە کچە پاڵەوانی شانوگەرییەکەو لەکەسایەتیە راستەقینەکەی خۆی دووری خستۆتەوە. گیانی کۆمیدی و گاڵتەجاریش کەشێوازی شیدرینی پێ‌ئەناسرێتەوە، بیساروڤ پێی وابوو خاڵییە لە پرۆتیستۆی کۆمەڵایەتی و ئیدانەکردن.

دەرکی بەگرنگیی رۆڵی هوشیاری نەکردووە لەژیان دا بەتایبەتی بەنیسبەت بیرکردنەوەی هونەرمەندو کارە ئەدەبییەکانیەوە، بەرای ئەو هونەرمەند واقیع ئەجوێتەوەو لەبەرهەمە هونەرییەکانی‌دا بەشێوەیەکی ساناو ساکار وێنەی ئەو واقیعە دووبارە ئەکاتەوە بەبێ ئەوەی فەلسەفەی ژیانی و خاسیەتە تایبەتییەکانی خۆی رۆڵێکی تیادا ببینن. ئەو داوای دەسپاکی و راستگۆیی لەهونەرمەند ئەکات لە گواستنەوەی ژیان بۆ پرۆسیسی داهێنانی هونەری بەبێ ئەوەی هۆش و بیری خۆی کاربکاتە سەری.

لەوتاری «بازاروڤ»دا پێی وایە تورگینیف بەشێوەیەکی بابەتییانەو دوور لەهەڵوێستی نووسەر کە هەڵوێستێکی ساردەو بازاروڤی خۆش ناوێ، پاڵەوانێکی نموونەیی ی وێنە کێشاوە. بەلای بیساروڤەوە هونەرمەندی بزورگ ئەوەیە کە ئیلتیزام بەراستگۆییەوە ئەکات و رواڵەتەکانی ژیان وەکو

خۆی پیشـــان ئەدات جا هەڵـوێستی هەرچ چۆنێـك بێت. دۆبـرالـۆبـۆف لەکۆتایی نووسینەکەیدا ئەڵێ: «تورگینیڤ لە رۆمـانـەکـەیدا وەکـو مرۆڤێك و هونەرمەندێك خۆی جێگیر ئەکـات، کاتێ سەرنـج ئەداتـە پازارۆڤ، ئەوسـا ئەگـاتـە تێگەیشتنێکی راست و هەڵسەنگاندنێکی دادپەروەرانەی ئەو نمـوونـەیـەی دای‌ئـەهێنێ». سەرچـاوەی هەڵسـەنگـاندنی دادپـەروەرانـەی تورگینیڤ بۆ پاڵەوانـەکانی لەوەوە دەرچووە کەلەبەرزییەوە ئەڕوانێتە کارەکانی و لە گۆشە جیاوازەکان و بەتێکچرژاویی ئەیانبینێ.

لەشیکـردنـەوەی «یـەفگینی ئەنیگین»دا بەدەرەنجـامێکی ناقـایلەوە دەرچـوو. ئەنگین و تاتیـانـای بەدوو کارەکتـەری واقیعی دانـا کەلـەژیـانی رووسی هەڵی‌هێنجـاون کەچی لەگـەڵ ئەوەشـدا ئەدگـارێکی ئایـدیـالیستـانـەی داوەتە ئەو پەیـوەنـدییـە فیـودالیستانەی لادێ، بەمەیش ئەبێتە نوێنەری چینی کۆنـەپـەرست نەك پێشکـەوتنخـواز. دەربـارەی کەسـایـەتیی ئەنگین ئەڵێ: «پـووشکین بەشێـوەیـەکی زۆر راستگۆیانە راستییەکانی تێبینی کردووەو وێنەکێشاوە، کاتێ مەسـەلـەکـە ئەم لایـەنـەی رەت دا بۆ روون کردنـەوەی راستییەکان، کەوتە هەڵەی گەورە گەورەوە».

بیسـارۆڤ لە دوا دوایی ژیـانی‌دا بە بنچینـەکـانی تیۆرە رەخنـەییـەکـەیدا چۆوەو سەرنجـدانی ئەدیبی لەمـەڕ سۆزو ویـژدانی پاڵـەوانـەوەی هەڵسـەنگاندو داوای لێ‌ئەکرد بیری نوێ پەسنـد بکـات و گوزارشتیشی لێ‌بکـات و لەواقیـع بگـات و گەشبینـانـە بڕوانێتـە پاشـە ڕۆژ کەژیـان لەگەشەسەندنیدا رەنگ ئەداتەوە.

* لەکتێبی (مدخل الى الادب الروسى في القرن التاسع عشر)

سەرۆکی فەرماندە صدام حسین رابەری لێهاتوو و
بلیمەتی کاروانی سەرکەوتنمانە

# پیاوێکی بەڕێز

کمال رؤوف محمد

لەناو دەنگەدەنگی منداڵی خووارو ژوورو تەلەفزیۆندا، خوشکی گەورە لەگەڵ خوشکی پچووك کە تازەبووك بوو، بەقسەی ژنانەوە خەریك بوون. کەمێ دوورتر لەوانەوە، هەردوو ئاوەڵزاوا کە یەکەم جاربوو بەیەکەوە دابنیشن، بەباسی جۆربەجۆرەوە خەریك بوون کە بەشی زۆری قسەش ئاوەڵزاوای گەورە دەیهێنایە پێشەوەو دووەمیش چەندی بتووانایە گوێی بۆ شل دەکردو خۆی گران رادەگرت. . .

جارو باریش بووکێ بە چاوی خۆشیی و ڕەزامەندی‌یەوە سەیرێکی دەکردن و دڵی بە گونجاویی هەردووکیان خۆش بوو.

باسی تازەش هاتبووە سەر پێویستیی ئوتوموبێل کە ئاوەڵزاوای گەورە بەجۆشەوە قسەی لی‌دەکردو گەییشتبووە ئەوەی بڵێ:

ـ وەڵلاهی کاکی خۆم من و ئەم ئوتوموبێلە بۆقەیان نەگوتووە؛ بەسەری تۆ، بەسەری خۆم کە لەناویدا دادەنیشم، شەرمم بەخۆم دێت ئەگەرچی تازەشە! بەس، ئەوە هەیە لەسەر قازانج ماوە، تەنانەت. . تەبیعی ئێمە خۆین، ئەم خانووەش هەر بەهۆی ئوتۆموبێل کرین و فرۆشتنەوە دورستم کردووە. با لێت نەشارمەوە، شتەکەش هیچێکی ئەوتۆی ناوێت، تۆزێ دان بەخۆتدا بگرەو چش سکی خۆت بگوشەو پارەیە لەم، پارەیە لەو بەقەرزو قۆڵە پەیدابکەو سولفەیە خۆت و سولفەیە لە یەکێکی‌ترو درێژەی نەدەمێ پارەیە کۆبکەرەوەو ئیتر بەرەبەرە فێری سەنعەتەکە دەبی! ئەرێ بەڕاست، نازانم چۆنە تۆ ئوتومووبێلت نی‌یە؟

دووەم بەزەردەخەنەیەکی ووشکەوە وەڵامی دایەوە:

● ئم، من؟ من هێشتا بەوەدا ڕانەگەییشتووم بیر لەشتی وابکەمەوە!

ـ غەڵەتی! هەقە زوو بیری لی‌بکەیتەوە! ئەلحەمدولیللا مەعاشەکەت باشەو وەکو ناوبانگیشتم بیستووە کوڕێکی ڕێك وپێکی‌وئیە. .

● سوپاست دەکەم ئەوە چاکیی خۆتە!

ـ کاکی خۆم، ئینسان، لەم ڕۆژگارەدا ئەگەر بیەوێ پی‌بگاو هەموو شتێکی نایابی هەبێ، زۆر بەئاسانیی پێی‌دەگات، بەڵام. . ئەمە، تۆزێ. . ئا هەر تۆزێ سەبرو ئارام و زیرەکیی دەوێ‌و پیاو نابێ بەشتی هیچ وپووچەوە خۆی خەریك بکا، مەسەل بەسیاسەت و نادی‌و یاری‌و خووادرنەوەو ئی، سینەمەو کتێب و ڕۆژنامەو ئەم جۆرە شتە قۆڕانەوە. . . بەڕاستیی، ئەمانە هەمووی پوولی‌ناهێنن، پوولێکی قەڵبیش!!

دووەم جگەرەیەکی داگیرساندو یەکەمیش لەسەر قسەی خۆی ڕۆیپشت:

ـ دیارە زۆر جگەرە دەکێشی؟ بەخووا شوکر من هەرگیز توخونی نەکەوتووم. هیچی تێدا بەستەر نی‌یەو مەسرەف زیادیی‌یە لێشت نەشارمەوە، من ڕێگای دوورو نزیکم دایەرەو ماڵەوەیە، بەڵام لەعەینی وەختدا چاوێکم کردووە بەهەزار، دەمەوێ شتێ بەشت بکەم، عانەیەك بکەم بەدوو. خۆت دەزانیی، پارە هەموو شتێکە!

دووەم بە هەستێکی تاڵەوە، لەسەرخۆ وەڵامی‌دایەوە:

● بەس هەیشە پارە بە هەمووشتێ دانانیْ!

یەکەم بەپەرۆشەوە رووی دەمی تی‌کرد:

ـ دڵنیابە ئەوی وابێ بی‌ئەقڵە . هەر پەشیمانیی دەهێنێ!

دەستی بۆ پرتەقاڵی بردو زیاتر پێی گوت:

- من ئەم پرتەقاڵە بەخۆڕایی پەیدا ناکەم. بۆ ئەوەی دەستیشم بکەوێ، دەبێ حسابی بۆبکەم، تەنانەت ئەگەر زۆر پێویستیش نەبێ، نابێ بیکڕم، چونکە ئەگەر وا نەکەم، هیچم بەهیچ نابێ، ئوتوموبێلێکی جوان و کەشخەو خانوویەکی ناسکم نابێ، نە پارەی. دەڵێم پیاو پارەی نوستوویشی نابێ، هەتا ناتوانم منداڵەکانیشم بێ بگەیێنم... ئا، رەنگە ئاسایی هەڵبدەن، بەڵام من نامەوێ وەکو خەڵکی ئاسابن، دەمەوێ جیاوازبن، گەورەبن خۆشت دەزانی کە گەورەیی لەناو خەڵکدا هەر بەپارەوەیە! تۆ سەیر بکە، من ئێستاکە کە لەناو ئەم ئوتوموبێلەدا دادەنیشم، جیاوازە لەگەڵ ئەوەی لە ئوتوموبێلێکی جوانتردا بم. شتەکە لەلای خۆم و خەڵك حسابی خۆی هەیە!

لەو هەڵەدا، دووەم دەستی بەناو چەوانیدا دەهێناو قۆپچەی ملی کراسەکەی دەکردەوەو روویشی لە ژنەکەی کردو بانگی ئاوی لێ کرد. دیار بوو، هەستی بە گەرمایی و هیلاکیی دەکردو هەتا ئاوەکەیشیان بۆ هێنا یەکەم هەر قسەی خۆی دەکرد گوایە نازانێ چۆن ئەم شەش حەووت مانگەی لێ دەڕواو ئوتوموبێلی تازەی بۆدەربچێ. دووەم کە بەدەم ئاوخواردنەوەوە لەسەرە داڕووتاوەکەی یەکەم وورد دەبۆوە، بیری بەو پرسیارەی دووەمەوە داماوبوو کە چەندجارێ گوتی:

- ئەرێ تۆبڵێی بۆم دەرنەچێ!

دووەم کە ئاوەکەی خواردەوە، بە ئانقەست پێی گوت:

● گریمان لە ڕاکێشانی ناوەکاندا تۆی بەرنەکەوتی؟

- بۆخاتری خوا نوقڵانەی وام بۆ مەدە. خۆشێت دەبم!

دووەم بە تەوسەوە پێی گوت:

● خوا نەکا خوا نەکا!

شێوەی قسەیشی گۆڕی و زیاتر پێی گوت:

● بەڵام کاك عەلی تۆ بۆچی شت وا بە گران وەردەگری؟



خۆ ئەم ئوتوموبێلەی ئێستات باشەو ئێ کەم مەسرەفە.

- دەم خۆش کەم مەسرەفە، کەم مەسرەفە، ئەمەڕاستە! راست دەکەی کەم مەسرەفی یەکەی تۆزێ سەبووریم دەداتێ، بەڵام بەخوا هەر تامی ئەوە نادا کە چاوەڕێی دەکەم بێقەزایی ئەمە لەکوێ و ئەوە لەکوێ؟ لە سەرێکی تریشەوە لەناو زەحمەتیی هات وچۆو ڕاوەستان و چاوەنوواریی زۆر، دڵم تۆقی کردووە گوایە ئەمە بەنزین ناخوات؟

● بەڵام ئوتوموبێلەکە خۆی بەنزین کەم دەخوات؟

- بەڵام بەنزین دەخوات یان نا؟ یەعنی نایەوێ؟

● هەڵیەت دەیەوێ!

ـ کەواتە ئەمە کفرە: باشە بۆچی جادەو ڕێگاوبان وا تەسك و ترووسك بێ؟ دووەم من نازانم ئەم خەڵکە کە پیادەن بۆ تۆزێ شەرم ناکەن و ڕێگا بۆ هات وچۆی ئوتومۆبیل خۆش ناکەن، بەڕاستی بەڕاستی زۆر بێنەزاکەتن دووەم تاڵە سمێڵی خۆی ڕادەکێشاو عەلیش دەمی چیکەنەبوو:

ـ ئاخر ناڵێن ئەو کەسەی ئوتومۆبێلی بەپارە کڕیوە کڕیویەتی و بۆ خۆشیی خۆی کڕیویەتی! ڕاستت دەوێ من، من وا هەست دەکەم کە ئەم خەڵکە هەقی ژیانیان نی یە . .تۆتۆ، تۆ سەیر، سەیربکە!

شتێکت بۆ دەگێڕمەوە کە ڕەنگە لەهیچ زەمان و هیچ وڵاتێکدا ڕووی نەدابێ. . . بازاڕم تەیکرد هەتا خامێکی باش و هەرزانم دەست کەوت. بە تەواوی هەوەس و ئارەزووەوە نیشتمە سەر مەکینەی دورمانەکەی دایکی عەلی و جووان جووان دوریم، کەچی، کەچی دوو ڕۆژی نەبرد، هەردوو ڕۆژی نەبرد لەبەر ماڵەوە چادرەکەیان دزیی. . ئائا، هەر لەبەر ماڵەوە ،تۆ سەیر لەم ویژدانە ؛کافرستانی یە!

دووەم بەتەوسەوە لێی پرسی!

●توخووا بەڕاستتە؟

ـ ئەیچی، گووایە بەگاڵتەمە! باشە توشەرەفت ئەمە پیاوەتی یە؟ ئاخر بابەئەم چادرە بەپارە کڕراوە، پارەش ئارەقی بۆڕێژراوە، ئارەق ڕشتنیش هیلاکیی ویستوو. .

● هیلاکیش عومر دۆڕاندنی دەوێ.

ـ وو ـ ووتت چی زەحمەت نەبێ؟

● گوتم هیلاکیش عومرزایە دەکا!

ـ ئاهـ هـ ،بەڵێ بەڵێ ،ئینسان بەبێ ئوتومۆبیل عومری بەزایە دەچێ!

عەلی پاش بیرکردنەوەیەکی تیژو خێرا، لە دووەمی پرسی:

ـ ئەرێ بەڕاست تۆ دەڵێی چی؟ چادرێکی تری بۆ دروست بکەم؟

ئەوەئارە زووی خۆتە!

●دەزانم دەزانم، بەڵام ،دەترسم ئەمجارەش بیدزنەوەو دیسان پارەم لەکیس بچێ! باشە، دەڵێم تۆ تەگبیرێ نازانێ تا نەدزرێ؟

●وەڵڵا بڵێم چی؟ تەگبیری چۆن چۆنی؟

هەرشتێ بەخەیاڵتدابێ!

دووەم ڕەنگی کرژ بووبوو، دیاربوو هەستی بەژانێ دەکردو وەڵامی نەدایەوە ،بەڵام یەکەم بەرۆکی بەرنەداو پرسیاری لێکردەوە:

ـ ووتت چی؟

● چی بڵێم کاك عەلی، ئەگەر هەردەزانیی لێت دەدزرێ ،چادری بۆمەکە!

ـ چادری بۆنەکەم؟ ئەی دەتەوێ مناڵە ووردکێ و هەتیوو مەتیو ئوتومۆبیلەکەم بڕوشێنن و پارە بەخۆڕایی سەرف بکەم؟ نا، خۆی ،دەبێ بۆی بکەم! بەڵام، بۆ دەبێ بدزرێ؟ ئاخ خ بمزانیایە کێ دزیویەتی خوێنم بخوواردایەوە!

● شتەکە زل مەکە کاك عەلی .ئیتر ئوتومۆبیلەو چادریی دەوێو چادریش دەدرێو دەدزرێو ئێ کەمێك ئاگاداریی بکەن و دەبڕێتەوە!

ـ بەڵام بەسەری تۆ نابڕێتەوە! ئەوا، ئەوا بڵێم چادرێکی ترم بۆ پەیداکرد، ئەی ئەگەر دڕاندیان، دزییانەوە؟ کورە تۆبڵێ خوا نەکەرا ئەگەر سووتاندیان؟

دووەم بەژانێکەوە وەڵامی دایەوە:

●وەڵڵا. ئیتر ئیشی خۆت خۆت دەیزانیی!

دووەم باوێشکی داو زۆریشی لاسەیربوو کە یەکەم باوێشکی نەداو بەڵکو پرسیاری تری لێکردەوە:

ـ ووتت چی، بۆیبکەم؟

دووەم باوێشکی تریهات و بەدەمییەوە گوتی

● بڵ ـ بڵێتم م م ـ چی؟

ـ بەڵام من وا تێدەگەم هەر بۆی بکەم چاکترە.

دووەم ڕوویکردە ژنەکەی:

● ئەری نەشمیل هەڵنەستین؟ درەنگە!

بووکێ ژنی وەڵامی دایەوە:

- ئارەزووی خۆتە!

دووەم بەدەم هەستانەوە بەیەکەمی گوت.

● درەنگیش بوو. ئێوەشمان هیلاك کرد!

ژنی یەکەم هاتەپێشەوە:

- ئاخر دەجارێ زووبوو، دانیشتبوون؟

● بەخوا درەنگە، هەتادەشگەینەوە ئوتێل و. . یەکەم و دووەم هاتنە لای دەرگای ژوورەکەو لەو هەلەدا کە دووەم دانەوی‌یەوە پێڵاوەکانی لەپێ‌بکا، یەکەم پێی گوت:

- بەراستت کاك ئارام، کەسێ دۆستێ ناناسیت چادرێکی زیادەی هەبێ؟

ژنی یەکەم هاتە نێوانیانەوەو گوتی:

- ئاخر کاك ئارام حەزدەکەم نەڕۆنەوە!

یەکەم وەڵامی دایەوە:

● سوپاس شیرین خان. فەرقی نی‌یەو خۆت دەزانی دەبێ خۆمان کۆبکەینەوەو، ئێە بەیانی زوو دەبێ بچین بۆ گەراج و. . .

- بەڵام ئەمجارەیان قەیناکە. ئەمجارە هاتن لەئوتێل دابەزن ڕازی نابم. ئادەی باوکی عەلی، دەی هەتا ئوتێل بیانگەیێنە!

دووەم بەجۆشەوە گوتی:

● نا، بەسەری کاك عەلی شتی‌وا نابێ. شیرین خان شەودرەنگەو. .

- بەخوا دەبێ بتانگەیێنێ!

● نا ناشیرین خان، سەرجادەکە هەمووی دوو هەنگاوێکەو. .

یەکەم کەوتە ناو قسەیانەوە بەدەم پێکەنینەوە بەژنەکەی گوت:

- کچێ شیرین ئەمان خۆێمەنین. گەنجن، باپیاسە بکەن! پیاسە!

کە هاتنە بەر دەرکی حەوشەو سەرلەنوێ سوپاسی شیرین خانی کردو تەوقەی لەگەڵ کرد، دەستیشی بۆ کاك عەلی درێژکرد کە ئەو لەبری دۆعاخووازیی پێی گوت:

- پێش ئەوەی بڕۆیت، پێت نەووتم دۆستێك ، برادەرێکت چادرێکی هەیە یا نا؟

ئارامیش بە ووردبوونەوەیەکی پڕ هیلاکی وەڵامی دایەوە:

● وەڵڵاهی کەس شك نابەم، بەڵام ،لەبەرخاتریی تۆ چاوێ هەڵدەخەم!

- چاوەکەمی هەر لەبیرت نەچێ! دەڵێم ئەو مەسرەفە بۆچی بکەم و یەکێکیش لێم بدزێتەوە! وانی‌یە؟

ئەگەر دەستت کەوت مەمنوونم دەکەی. بەڵکو بە شۆفێرێکی ناسیاویشدا بۆم بنێری!

● ئینشاڵڵا، خەمت نەبێ.

- یەعنی تەواو دڵنیابم !لەبیرت ناچێ؟

● نا، بەسەرچاو! دەی نەشمیل! ئێ شیرین خان ماڵ ئاوابێ.

کە لێیان جیابوونەوە، بووکێ بە دڵێکی خۆشەوە قۆڵی بەقۆڵی مێردەکەیدا کردو پێی گوت:

- ئارام گیان توخوا کاك عەلی چۆن پیاوێکە؛

مێردەکەیشی گوری پێداو ئەمجا سەری خستە پەنا گوێ‌یەوەو بەتەوسەوە چرپاندی:

● ئەها توسەری کاك عەلی عاجزمەبەو سکم وەختە بتەقێ بایەکی لێ‌بووەوە.

- ژنەکەیشی بەسەر سامی‌یەوە پێ‌ی گوت:

- ئەوە چیت کرد؟

ژنەی سەیری ئەم لاو ئەولای کردو بە دڵتەنگی‌یەوە زیاتری پێ‌گوت:

- بەس نی‌یە کەس بەدەروەنی‌یەو بڵێ ،بڵێ ئە‌ پیاوە. .

قسەی‌گۆڕی‌و بەنازو گلەیی‌یەوە قسەکەی تەواوکرد:

- ئاخر ئارام گیان، عەیـ ـیب ب ـ بوووو!

# وەسیەتا بابێ



خۆ ل بەر سوپێ درێژ کربوو، پێیەك ل سەر یێ دی را هاڤێت بوو هەر جار دا قورمەکێ ل جگارێ بدەت دیکێلا جگارێ وسا ژدەڤ و دفنا دەردکەت هەروەکی ئاگری بەردەیە دیهەکا گیایی ئوەیکێل ژێ بلند ببت. یا وەل مەزەلێ کری هەروەکی کو مرەك تێڤە هلکری.

هەر پیچ پیچە یێ خۆ دکێشتە بنك سو پێڤە «زڤستانا ئەڤ سالە چەندا سارە مرۆڤ نەشێت ژ خانییێ خو دەرکەڤیت» مەزەلا گەرم بی بەلێ پا ژدەرڤە گەلەك سارە. .

- برایێ ئافدەل. . . هەکە سالەکا دژی بەرهەمێ ملکی هەر هوسا هات ئەم ناقەتینین ڤیابیت بخو پرسیارا ڕێکەکا دی بکەین. .

- ئەرێ بخودێ برا حەسەن. . ژمێرە وەرە ئەڤ هزرە دەسەرێ من دا، بەلێ ما چ لبابێ‌خو بکەم پیچەکێ چاڤیت وی چووبونە سەرێك. . ل هیڤی‌یا تیشتێ مابوو. . .

- دێ رابە جامێرو ئەڤە من بۆتە تێشت ئینا. .

بسەرخوڤە هات بێ‌ی کو ئاخفتنەك ژدەڤی دەرکەڤیت.

- ئەڤە تەخێرە تو هوسا کویر چووی. . . ؟ دێ رابە تێشتی بخو. . ئو هەرە بومە بارەکێ دارا. . دارێت مە کێمێت ماین بزور تێرا ئەڤرو بکەن.

- براستی حرمەت مادێ‌چ ل تە ڤەشێرم. . ئەڤێ سالە بەرهەمێ ملکێ مە گەلەکێ کێم بو ئو ئەڤ زڤستانە دێ یا درێژ بیت نەکە. .

- خەما نەخو جامێرو هیڤی‌یا خودێ ئەڤ سالە کێم، سالە کادی بەلکەی باشتر بیت.

تێشتا خار. رابو هێسترا خو كورتان كر داس و بڤرێت خو ئینان كرنە دبەر پشتا هێسترێ را.. ئولێ سیار بوو قەستا ئاقاری كر. دەرسوكێت خو دبن گوهێت خوا را برن ژ بەر كو هرو بایەكێ ب هێز پێ تێت هێش خویسارێ عەرد نە بەردایە، گەلەك جارا هێسترا وی یا دتەحسیت. مروڤ تف كەت هەر دوێ گاڤێ‌دا دێ مەهیت.. بەلێ ڤیا بیت بچیت هەكە دێ عەیالێ وی ژسەرمادا قربیت «دڤێت ئەز بچم هەكە ئەز برێڤە مری‌مە بلا ئەز بم نەكو ئەو عەیالێ هیر بیت».

- باب.. ما بوچی ملكێ خو نافروشین ئو بچینە باژێری‌دا..

- كورو ئاڤــدەل..! ئەو چ ئاخـفـتنن تو دبێــژی، من جارەكادی گول تەنەبیت تو ڤی بەحسێ بكەی..

- ما هەتا كەنگی ئەم دێ ل ناڤ ڤان چل و چیا ببن ڤان زفستانێت هند نەخوش. ما بوچی ناچین مالا خو بەینە باژێری ئو دەست ب شولەكێ دێ بكەین سەد جار ژڤی شولی ب ساناهی تر..

- گوهێ خو بدە من كورو.. هندی ئەزێ ساخ بم ئەو ملكێ باب و باپیرا بو مە ئینایە دەرێ ئو چاندی‌و مە خێر ژێ دیتی نائێتە فروتن.. ئەرێ ما تو نوكە بچ دژی نەبدراڤێ وی ملكی‌یە..؟

(یــا خودێ.....) ڤێ جارێ ژێ هێــــســتــرا وی هەلنگفت لسەر پشتا هێسترێ فری دنگ و ف عەردی كەت ما بەرێ خو دا هێسترێ دیت كو وەسا هەلما ژدەڤ‌ودفنا دچیت هەروەكی ئاڤەكا كەلاندی هەلم ژێ رادبیت..

«هێستر هەڤە من باڤێت ڤێ سەرمایێ‌و شول و دەركەتن بەلێ هەكە مالا من ل باژێری با هوسا چێ‌نەدبوو».

جارەكا دی رابو ل هێسترێ سیاربوو برێكەت جار جارا پێ دەستێت خو ژ بەریكێت ساكوی تینتە دەر رەتە بەر دەڤێ خویێ پڤ دكەتێ.. تبلێت وی یێت سور بوین دەستێت وی نا كەڤنە سەرێـك.. خو گەهـانـدە بنێ چیـایی، لبەر بەتـەنـەكێ راوستـا بارێ دارا كر ئینـا دەست ببـاركـرنێ‌كرد دارێ هەتا گەهشتی‌یە وی گركێ ب هنداڤ چەما پێ كو بەری چەند روژەكا ئەو وبابێ ل وێری درینشتی.. هندە ئاڤێ خو كرە روندك و هێدی بسەر رینێت وی‌دا هاتنە خارێ بابێ وی هاتە پێش چاڤا هەكو گوتیێ:

- بابو وسیەتا من لتەبیت پشتی مرنا من تو دەستا ژڤی ملكی بەر نەدەی.. چنكی مە نانێ ژێ خاری ڤێجا بحو چێكـەو چاڤێ خو بدێ.. پتـر رونـدك ژچـاڤا هاتنە خارێ دەمێ هاتیە بیراوی كو بابێ وی سەكەراتێ ژی دا هەر وە دگـوت.. دەست هاڤێتـە كەڤیكـا خو ژ بەریكا خو ئینا دەر ئەو روندك پاقژ كرن وگوت:

-سوزبیت باب.. ئەز ئاخفتناتە نەشكێنم ئو چی تشتێ تە گوتی ئەز بجهـ بینم.. ئو پتر خو بوەستنیم دا مافێ تە لسەر خو راكەم. ئو وەل بچیكێت خوژ ی بكەم كو چ جارا ملكێ خو ژ بیر نەكەن. ئەڤی ملكێ هندە هندە سالە ئەم پێ دژین نەهێلم پیچ ببیت.

# یەکبوون

مدحت بێخەو

**بۆ** ئەرکی ڕێ..
**ئەو** کاتانەی کە دەمەوێ
**بۆداماوان** بکەم تەگبیر
**پێنووس** بکەم بەکەوان و
**بیرو** وشەش بکەم بەتیر
**وشەکان** دێنە پێشەوە
**گرد** دەوەستن
**بەرەو** هەوراز
**بەرەو** نیاز
**ئامادەو** گیان لەسەر دەستن
**بەرچاویان** تەماوی و لێڵە
**ریزیان** وێنەی..
**گێرەکەی** (ئۆمەرەخیل)ە[1]
**هەرچەند** دەکەن
**ناگەن** بەهیچ نە زۆر نە کەم

کەی پەیرەوی واتەم دەکەن
پێتان خۆشە هەر ئاوابن
من مەدوێنن..
لە فەرهەنگتان دەرم بێنن
سێ وشەکەی..
هەڵمات..پیور..کەو.. بدوێنن..
من بخەنە بیری ون بوون
چیتر بانگم مەکەن یەکبوون..

× × ×

ئارەقە ناکەن دەبینن..
چۆن خۆرو گڵ و ئاووبا
بەتین یەکتر دەگرن هەموو
تا بۆ گیان لەبەری زەمین
خۆراکی ژیان بێتە ڕوو

× × ×

هەنگ و گوڵ و شانەی هونەر
بەیەکبوونیان..
بۆژین شیرینی دێننە بەر

× × ×

شیعر..ئاواز.. دەنگی ڕەسەن
بە سێقۆڵی
سۆزو خرۆشمان پێدەدەن

× × ×

ژێی و پەنجەو داری‌کەمان
بەهاوکاری
دەبەخشن ئاوازی گیان

× × ×

حەفت ڕەنگی پەلکە زێرینە
هەموو یەك ریز خۆدەنوێنن



لۆ سروشت و دڵی مرۆڤ
جوانیو خۆشی دەبەخشێنن
× × ×
چۆلەکەکان لەدژی مار
کۆمەڵ دەبن دەم بەهاوار
تا ریسوا یکەن و نەیهێڵن
بەهۆی ڕێبوار
× × ×
بەفرو تەرزەو ڕێژنەیباران
هەموو یەکتر دەگرنەوە
دەبن بەجوگەلەو بەزێ
لەناو دڵی دەریای دایك
ئاوێتەی یەکتر دەبنەوە . .
× × ×
بەڵێ ئەمانە سروشتن . .
ئێوەش بیرن . .
بەڵام بۆیەکتری هەردەم
داوو بیرن .
من مەدوێنن
لە فەرهەنگتان دەرم بێنن
پێتان خۆشە هەرئاوابن
وەك ڕاهاتوون
هەڵمات . . بیور . . کەو . . بدوێنن
من بخەنە بیری ون بوون
چیتر بانگم مەکەن یەکبوون . .

---

(1) ئۆمەرە خیل = براگەورەی سیانەکانی گوندی (قوچ) بوە لەکەندیناوە کاتی خۆی بۆ قورشێلان گێرەی بەهێستران کردوە.

# گلپەی خۆشەویستی

- نەوزاد عەلی حەسەن -



خەم ڕێبوارە . .
ئەم هەوارە بەجێ دێڵێ
ئاسۆی تیشکت
بەگاسنی خۆشەویستی
دڵ و دەروونم دەکێڵێ
تۆ گوڵێکیو لەبەهاری
خەیاڵم دا سەر دەردێنی
تۆلە [سەفین] بڵندتری
خۆشەویستی دەنەخشێنی
تۆ فێرکەری ئاسەی
ئەڤینی ژینم بووی
تۆ گڵپەی گڕگرتوی
دەروونم بووی
بێ‌تۆ **نا**ژێم . . . **بێ**تۆ ناژێم
خۆشم دەوێی . . . **خۆشەویستم**

# بەند

نینۆك لە پەنجە جیا ناکرێتەوە
کە بیشی‌بڕی هەر خۆی دێتەوە
بەم جورەش لەگەڵ خزمو کەسوکار
تف ڕو لە ئاسمان ڕوو ئەگرێتەوە
بیرم لە عومری خۆم کردوتەوە
وەکو مۆم وایە کە دەتوێتەوە
سەیرە لەم دنیا هیچ حاڵی نەبووم
تاکو ئەم ساتە چۆن ئەخولێتەوە
ئەوەی رەنجاوە خۆی هەر دێتەوە
گەرم هەر ئەبێ سارد ببێتەوە
ئاگری سوری جوان بۆتە خۆڵەمێش
بەڵام ڕۆژی دێت کە بژیەتەوە
ڕێگایەك خواربێ ڕاست ئەبێتەوە
برینی دڵمان چاك ئەبێتەوە
دەرمانی دەردمان هەر یەکێتیە
گیا لە سەربنجی خۆی ئەڕوێتەوە
بەفری رووله خۆر زو ئەتوێتەوە
چرای روو لە با کە ئەکوژێتەوە
هیواو مەبەستی دڵی تاریکم
لە شەوی ڕەشدا ئەگەشێتەوە
کە چویتە دنیاگیان ئەشنێتەوە
وەك داروگوڵە بەرز ئەبێتەوە
لە خەو‌دا بینیم جارێکیان بەهەست
بەخوا زۆر خۆشە گەر جێم بێتەوە
ئەڵێن کە مردیت دیسان دێیتەوە
پشتت بۆ دنیا ئەبەستێتەوە
لە جاری پێشو من خۆشیم نەدی
خودا گیانی من قەد نەژیەتەوە

علی أبراهیم درویش




که چیابووم . . .

له زمانی شاخەکانیش دەگەیشتم
رووبارەکان لەژێر پێما ئەیان ناڵاند
هەورو ئەبوو بە جۆتەباڵ
ئاسمان ئەبوو بە هاوپشتم

پەت پەتێنم بە هاوین و زستان ئەکرد
بۆ رۆژ ئەچوومە خوازبێنی
بەحەسرەت بوو مانگی رووگەش
بم دوینێ . . .
بەر هەنگاوم نزارێکی پرنەشمیل بوو
تەنیا دڵم ئەشکەوتێکی بێ‌کلیل بوو
که بەرماڵی بیابانی چاوی تۆبووم
پەیامبەری خۆشەویستیم
له کافرەکان ئەشاردەوە
خەونەکانی «گلگامش»م ئەدوریەوە
داری «موسا»م ئەچاندەوە
من بووم «نوحتی»م له دەریاکان
پەراندەوە . . .
«عشتروت» «عشتروت» عە . . . ش . . . تە . . رِوت
تەنیا تۆبووی گەردەلوولی
هەڵچونمت . . .
پاچاندەوە . . .
پا . . . چا . . ن . . . دە . . . وە

**پەراوێز**

---

گلگامش: ئەم پاڵەوانەبوو که بەدوای (ئاوی حەیات)ونەمری ئەم سەرو ئەوسەری جیهان ئەکرد

نوتی: ئەو مرۆڤەبوو که رێگای دەریاکانی ئەزانی وە گلگامش هانـای ئەبـردەبـەری یارمـەتی بدات لەبـەگـەیشتن بە گوڵەکانی ژێردەریا که ئەگەر گلگامش بیخواردایە هەتاهەتابێ نە ئەمرد

عشتروت: ئەو خواخـانمـەبوو که هەموو ئەو کەسانەی خۆشیان ئەویست شێت ئەبوون و لەناو ئەچوون . . .

# خازگینی

حکمت جمعه کورێمەی

من شنی زانی
خازگینیکێت نازکا من
بر بر بیێت تێن
وا ئەڤینا دلێ من
بقەتینن
ئو بینن دەر
ئو بسوژن
وێ بهاراب خەمل و گیا
بەلگو گولێت لێ بژیاین
لمن بکن وارەك سوتی
بەلێ وانا هزر نەکر
هندی خازگینی پتر بێن
دێ ئەڤینا مە
یاخوش تربت
دێ رەنگێ گولێ
لمە گەش تربت
دێ رێکێت تاری
لمە رون تربت
دێ ئەڤینی
هەر گەش تربت
هەر گەش تربت



# پیرۆزبە ٧٥ سالیا پرۆفیسۆر قەناتی کوردو

کورددا، ناڤێ وی چیبابی: قەناتێ کوردۆیە.

بلیمەتێ کوردا ق. کوردۆ ل کوردستانێ و دەرڤایی سنوورێن وێ هاتییە ناسین وەك زمانزانەکی بەهرەدار بەرهەمێن وی گەلەك گرانبهانە ژ گەلێ مەرا و ئەو بخوە پر نێزیکە ژ هەر نشتمانپەروەرکی کوردرا نێزیکە ژ کارکەر و جۆتکارێن کوردستانێدا، ئەوێ جهێ د پاشەرۆژدا هین بێتر ببینە د هەر مالەکە کوردا.

بەری نها ب 75 سالان ق. کوردۆ ل گوندێ سووسزبێ ناڤچەیا قەرسێ ل کوردستاناتورکییێ هاتە دنیایێ قەنات هین زارۆ بوو چاڤێن وی ب ستەمکارییێ و کوشتنێ کەتن، گاڤا کاربدەستێن تورکان خشم و بێتارەکە مەزن ب سەر گەلێ ئەرمەنیدا باراندن سالا 1915دا، د وێ سالێدا چاوا دبێژن نێزیکا میلیۆن و نیڤ میلیۆن ئەرمەنی هاتن شەرێکرن، کوشتن، د وێ قەسابخانێدا گۆشتێ پر کوردان ژی هات پەرچەکرن. بۆنا پاراستنا ژیانا خوە هنەك کوردێن مە یین ئێزیدی نەچار بوون برەڤن لە گەل ئەرمەنییان و هاتن ئالییێ رۆژهەلات ژ چەمێ ئاراس ـ ئەرمەنستانا رۆژهەلات. تەڤی ئەو چەما ژی ژ رەڤوکان را بێولوڤان بوو. پر ژ بچووکێن کوردان دا بەر لێمشتا (لەهییا) خوە...

ق. کوردۆ ل جهێ نوو سێوی (هەتیو) دمینە، پسمامێ وی ل هێلا پرێڤانێ وی ب خوەدی دکە پاشێ کورێ

گەنج قەنات دەرێ باژارێ تبلیسێ (پایتەختا گورجستانێ)، ل وێدەرێ دخوینە و سۆلێن خەلکێ

تم دل هێورییە ل چیایێن کوردستانێ ئیلهامێ ژ سەرتیا وانا وەردگرە و ب قاسی چیاکی پەنگرییە د سروشتێ کولتوورێ کوردیدا، د چەسپاندنێ هەبوونێ گەلی

د. حسین رەهبەر

پاقژدکە بۆ ژ بێنێ. ژ داویا سالێن بیستاندا و هەیا رۆژا ئیرۆ ق. کوردۆ ل بازارێ لێنینگمرادێ جحواردبە و بیٚ وەستان دخەبتە لسەر زمان، دیرۆك، ویژە، فۆلکلۆر و پەروەردەکرنا پسپۆران بۆ چاندا (کولتۆرا) کوردی.

ڤایە بێتری 50 ـ ی سالە کێفەرانا هۆزانێ کوردا ق. کوردۆ بەردەوام دراژەندنێ کولتۆرێ کوردیدا، د ڤێ رێیێ دوور و درێـژدا گەلـەك جاران خەمگین دبوو گوف دبـوو، پەست دبوو، شاد بوو؛ زەحمەتە رێێ چۆلبر ئەگەر کەس بەرێ تێـرا نەجـوو بە لسـەر وێ رێێ مرۆڤ شاش دبـە، دکەڤە، لێ قەناتێ کوردان ل کەڤر وکوچکێن سترێێن سەر رێ نەترسی ،سـەرێ کەروانـا چانـدا کوردی دکشـانـد بەرهـەمنـە زانستی نرخین ئافرانـدنـە. ئەگەر مرۆڤ ل وانا ب هووری تەماشـەکـە دبینـە هەریەك ژ یەکێ گرانبهـاترە؛ هەریـەك ژ وانـا ڤالایـەکـە مەزن تژیدکـە د پرتـووکخـانـا کوردیـدا، بۆ نمـوونـە ئەم کارن چەنـد کاران رابـەری خوەندەڤانان کن:

ـ فەرهەنگا کوردی ـ رووسی. 1960، 890 رووپەل،

ـ گرامـاتیکـا زمـانێ کوردی لسـەر مەتـریـالێن کورمـانجی وسۆرانی. 1978، 293 رووپەل.

ـ فەرهەنگا کوردی ـ رووسی (سۆرانی) ب زماناسا هێژارا زەرا یۆسپ .1983، 752 رووپەل.

زانایێ مەزن ق. کوردۆ خوەندەڤان و رەوشەنبیران دلشاد دکـە ب دەرکـەتنـا پرتـوکـا پر هێـژا ئا ب تیپێن لاتینی چاپ بوویـە سالا 1983ب سەرنڤیسا «تـاریخـا ئەدبییـەتا کوردی» ـ 1 ـ و د وێ بەرهـەمێـدا چەنـد گۆتـارنـە نرخین بەلاڤ بوونـە سەر ویـژەیـا کوردی و پێنـاسینـەك ژ سێـزدە هەلبـەستڤـانێن کوردرا (کـورمـانجـان) ژ عەلی حەریری و هەیا قەدریجان و ئەو پرتۆکا یەکەمین ئەنتەلۆگییا شیعرییە ب لاتینی تێ چاپکرن...

ق. کوردۆ ب کارێـن خوە یێـن زانـستی و هن یێن مە بنـاڤنـەکـرنـە پرتۆکخانا کوردی دەولەمەند کرییە ب جۆرە، جۆرە ئافراندین هێژا وی نە تەنێ گۆتار و پرتۆك نڤیسینە، ئەو ژ سالا 1961دا سەرکـاریـیـا «بـەشـێ کوردی»ل ئینستیتـووتـا رۆژهـەلاتنـاسییێ ل لێنیگـرادێ دکـە ،د وی بەشیدا گەلـەك زانـایێن پایـەبلنـد هەبـوون و هەنـە ئەونـا بەرهـەمێن زانستی تەکـووز پێشکـەشی رۆژهـەلاتنـاسییێ. خوەندڤانێن سوڤێیتێ و گەلێ کورد دکن.

ق. کوردۆ یەکـە ژ باشتـرین پێـداگـۆکـە هەیـا نهـا 19 دۆکتۆرێن زانستی ئامەدکرنە ژ کوردناسییێرا و پرانییا وانا خەلکێ کوردستانێنە ،هێڤیا مە ئەو کو شاگرتێن وی کارێن مامۆستا یێن وەرنەگراندی کوردی وەرگەرتین زمانێ مادەرو زمانێن دن.

ل داویێ ئەم جارەك دن 75 سالیـا زانـایێ مە قەنـاتێ کوردۆ پیـرۆز دکن ژێـرا و ژ مالبـەتێـرا دخـوازن ساخییێ سالێن درێژ و بەختەوارییێ بیگومان ئەم دبینن ق. کوردۆ یەکـە ژ بەختـەوارتـرین کورێ کوردستـانێیە ژ بەر وی ب دلسوزی ، ب ئەڤینەکە مەزن خزمەتا ملەتێ خوە کرییە و کی لسەر وێ رێیێ بچە گەل وی د دلی خوەدا دپارێزە و ژ وێ یەکێ رووممەنتر نییە لسەر رووێ زەڤی، لسەر رووێ ئەردێ.

# سلاڤ ل ته هه‌لال به!

جاره‌كی سێ ڕێوی ڕێكێدا چوون، ڕێڤا سیاره‌ك ڕاستی وان هات. سیار گۆت: «سه‌لام عه‌لێكم گه‌لی خۆرتا!» وانا گۆت: «عه‌لێكم ته سه‌لام، سه‌ر چه‌عڤارا تو هاتی سیارۆ». سیار وان ده‌رباز بوو چوو. وان هه‌رسێ ڕێوی‌یا ڤركا هه‌ڤ گرت، یه‌كی گۆت: «سلاڤ دایه من». یێ دنێ گۆت: «نا، نا، سلاڤ دایه من». یێ سسیا گۆت: «سلاڤ دایه من». هه‌رسێكا گه‌له‌كی هه‌ڤڕا كرنه شه‌ڕ هه‌ڤاله‌كی گۆت! «قوربا ئه‌م چما ڤركا هه‌ڤ دگرن؟ سیار هێ نێزیكه، وه‌ره ئه‌م گازیكنێ برا بێ، ئه‌م ژێ پرس كن چكا ژ مه هه‌رسێكا سلاڤ دایه كیژانی؟».

گازی سیار كرن، سیار هاته جه‌م وان. ڤان هه‌رسێ هه‌ڤالا لێ پرس كر، گۆ: «سیار، تو ئیدی خاترێ ناڤێ خوه‌دێ، تو وه‌ره مه‌ڕا ڕاست بێژه، چكا ته ژ مه هه‌رسێكا سلاڤ دا مه كیژانی» سیار گۆت: «قوربا، سلاڤ ـ سلاڤا خوه‌دێ‌یه، من دایه وه». وانا گۆت: «ناخێر، گه‌ره‌كێ مه‌ڕا بێژی، چكا ته ژ مه هه‌رسێكا سلاڤ دا كیژانی؟» سیار گه‌له‌كی دوشورمیش بوو، گۆ: «هه‌ڕن ژ وه هه‌رسێكا كی ئه‌خمه‌خه من سلاڤ دا وی‌یا».

وان هه‌رسێ هه‌ڤالا هه‌ڤڕا گۆت: «خوه‌دێ مه قوربا ته‌كه، تو هه‌ڕه ئۆخڕا خوه نه‌مینه» ئه‌مێ خوه‌خوه حه‌ساڤێ خوه ڕاست كن». سیار ئاژۆت چوو. وان هه‌رسێ هه‌ڤالا گۆت: «وه‌رن ژ ڕۆژا ئه‌م بوونه حه‌تانی ناكا چ سه‌رێ مه قه‌ومی‌یه ئه‌م بێژن، چكا كی ژ مه ئه‌خمه‌خه، سلاڤ یا وی‌یه».

هه‌ڤاله‌كی گۆت: «ئه‌ز بۆیاخچی بووم، من ڕۆكێ ڕیس ئاڤیته ده‌نێ، سیا من كه‌ته سه‌ر حه‌ووزم ژی ترێ دز كه‌تی‌یه هوندوورێ خه‌ووز، من گۆ: «هه‌ڤه ـ تونه‌ڤه ئه‌ڤا دزه هاتی‌یه ڕیس بدزه. من چووگازی خۆرته‌كی ب سه‌رخوه كر، من گۆ: «قوربا، وه‌ره دزه كه‌تی‌یه هوندوورێ حه‌ووز، وه‌ره ئه‌م دز بگرن». خۆرت لێخست هات، من چوو مێركوته‌ك ژێرا ئانی. من گۆت: «ئه‌زێ ڤا بكه‌ڤمه هوندوورێ حه‌ووز دز بگرم، وه‌ختێ كیژانی سه‌رێ خوه بلند كر تو زانبی ئه‌و ویخی».

خۆرت گۆت! «برا به». ئه‌وی مێركوت ده‌ستێ خوه‌دا حازر گرت. گۆ، گه‌لی هه‌ڤالا ئه‌ز كه‌تمه هوندوورێ حه‌ووز دز بگرم. ئه‌ز ڤردا گه‌ڕی‌یام، وێدا گه‌ڕی‌یام، كه‌س تونه. چا من سه‌ری خوه ل حه‌ووز بلند كر ئه‌وی خۆرتی هه‌تا قه‌واتا وی هه‌بوو ئه‌و مێركوت ل ناڤ چه‌عڤێ من خست. قووژین ل سه‌رێ من هات، به‌ر چه‌عڤێ من ڕه‌شێ ڤه‌هات، خوونا سۆر ل سه‌ر مدا هات. من گۆت: «ری، وی، كوڕێ كه‌رێ لێ ئه‌و ئه‌زم؟». خۆرت گۆت: «كوڕێ كه‌رێ تو بی، ته گۆت كی سه‌رێ خوه بلندكه لێخه، م ژی لێخست گونه‌كاری‌یا من چیه؟». ئه‌ز سێ مه‌ها كه‌تمه ناڤا جییا حكیمێ سی‌وسێ كێل سه‌رێ من دا. پاشی سێ مه‌ها ئه‌ز هنه‌كی سه‌ر خوه‌دا هاتم. گه‌لی هه‌ڤالا ئه‌ز ئه‌خمه‌ق نینم؟ سلاڤ ناگیژه من؟ سه‌ر تونه ئه‌وی خۆرتی ئه‌ز سێ مه‌ها كرمه ناڤا جی».

هه‌ڤالێ دودا دڤێژه! «ته‌و، ته‌و، ئه‌و چیه؟ ئه‌خمه‌خ ئه‌زم، سلاڤ یا منه» هه‌ڤالا گۆ: «چ سه‌رێ تو قه‌ومیه مه‌ڕا شرۆڤه بكه». گۆ: «»گه‌لی هه‌ڤالا، ئه‌ز نزانم زانینا ئه‌ز زانم ئه‌ز وه‌خته‌كی ده‌رسدار بووم، ژ كۆما یه‌كێ حه‌تا یا چارا من ددا خوه‌ندنێ. من ئوسا كربوو، ڕوحێ وان شاگرتا قه‌لا كربوو تابا زارا ده‌ستێ مدا تونه‌بوو. وه‌ختا من ده‌رێ ده‌رسخانێ ڤه‌دكر، وه‌ختێ شاگرت چه‌عڤ من دكه‌تن، ل سه‌ری حه‌تانی لنگا دله‌رزین. شاگرتا دیت تابا وان ده‌ست مدا تونه، ته‌وا گلییێ خوه كره یه‌ك، گۆت: «وه‌ختا سه‌یدا تێ ده‌رێ كۆما یه‌كێ ڤه‌دكه برا شاگرت ته‌ڤ ڕابنه پییا، بێ: «ڕه‌حێ، چه‌عڤێ مه برژه، مالا مه خراڤ به، ئۆجاخێ مه كۆر ڤه، سه‌یدایێ مه ئیرۆ چڤا ڕه‌نگ ئاڤیتی‌یه». وه‌كی چوو ده‌رسخانا دودا برا برا ئه‌وژی ئورسا بێژه، ئوسا ژی ده‌رسخانا سسیا ئو چارا بێژه، به‌لكی ده‌رسدارێ مه خوه نه‌خوه‌ش داڤێژه، ئه‌م چه‌نده‌كی حێسا بن». ئه‌و گۆت: «گه‌لی هه‌ڤالا، شاگرتا ئوسا ژی یا

نووسینی : جەلیلی جەلیلی
ئامادەکردنی : شکور مصطفی

حوە کر. من دەرێ دەرسخانا یەکێ ڤەکر، شاگرت بەر من ڕوونەپییا، گۆ: «چەعڤێ مە برژە، دەرسدارێ مە چقا ڕەنگ ئەڤیتی یە». من هنەکی قودوومێ چوکێ خوە سست کر. جارکا مایین من گۆت: «دڤە زار دەرەوا دکن».

ئەز چوومە دەرسخانا دودا، وانا ژ ی ئوسا گۆت. چوومە یا سسیا ئوچارا وانا ژ ی گۆت: «ئۆجلغێ مە کور بە، دەرسدارێ مە چقا بێ کێفە». ئەز دوشورمیش بووم، من گۆ: «هەبە ـ تونەبە ئەز بێ کێفم. شاگرت تەمام دڤێژن تو نەخوەشی». من گۆتە شاگرتا: «گەلی شاگرتا، ئەز نەخوەشم، هوون هەڕنە مالێ خوە، حالێ من تونە ئەزی هەڕم مال». شاگرت گەلەکی شابوون». گۆت: «گەلی هەڤالا ئەز ئەخمەخ نیبووم؟».

سلاڤ ناگیژە من؟ وەکی ئەزی ساخی ـ سلامەت من گوڕا گلیێ زارا کر؟ خوە نەخوەش دانی ئەز چوومە مال. من گۆ: «دایێ جیێ من داینە ئەز زەعف نەخوەشم». دییا من گۆ: «چما، ئەز قوربانا تە بم؟ تو ڤێ سپێ سپی ـ سەلامەت، ئەو نەخوەشی تەڕا ژ کو هات؟». من حەفت ڕۆژا خوە نەخوەش ئاڤیت ناڤ جییا. من حەفت ڕۆژا نە نان خوار، نە ئاڤ. دییا من چەند جارا خارن مڕا دانی من دگۆت؛ «نەخوەشم حالێ من تونە». پاشی حەفت ڕۆژا دلێ من نەدسەکنی، بەرچەعڤێ من ڕەشە ڤەدهات، دلێ من خوەڤا دچوو، ئیدی ئەز برچینا قودووم کەتم. دیسا ئەز خارنێ ناخوم. ڕۆژا حەفتا دییا من کفتا چێکربوو، کفتە قلپە ـ قلپا وان بوو دیزێدا دکەلییان، لێ دییا من بۆنا من دگرییا، پێ پێشا شەعلکا خوە هێسرێ چەعڤێ خوە پاقش دکر، ئوسا ژ ی کەلوگری چوو بەر دێری. وەختا دییا چوو بەر دێری، من ئیدا برچینا خوە زەفت نەکر، من دەرێ دیزێ ڤەکر کفتەك لێ دەرخست، کفتە چا برە دەڤێ خوە بوو چیرینییا دێری، دییا من دێری ڤەکر هاتە هوندوور. نە ئەوە ئەز کفتە بخوم، نە ئەوە ئەز باڤێژم. کفتە ژ ی گەرم، بوو، دەڤێ من دشەوتینە من ڤی ئالی دەڤێ خوەدا بر ئانی، وی ئالی بر ئانی، ئیدا من کفتە نەئاڤیت، من گەپا خوەدا هشت. گەپا من شەوتی، هێسرا چەعڤێ مڕا ئاڤیت، خودانی سەر مڕا ئاڤیت، ئو من ئۆرخان کشاندە سەر چەعڤێ خوە. دییا من هات ئۆرخان سەر من هلدا، وەختا چەعڤ من کەت گەپا من وەرمی یە، سەر چەعڤێ خوە ڤەڕووت، گۆت: «وی خایێ ئۆجاخێ من کورکە، ئێشا کورێ من گەوری یێ گەپ لێ وەرمی یە، وێ وەختا کورێ من بکوژە».

بوو ڤیرینیا وێ، چوو پەی حەکیم، حەکیم هاتە سەرمن، دەستێ خوە دا سەر گەورییا من پاشێ دابەرگەپالێ نهێری جییێ وەرقی هیشکە، چاگووزان دذا گەپا من بقەلشە کفتێ گەپا مڕا. گەلی هەڤالا، ئەڤا گەپا من، ئەڤا ژ ی برینا گووزێن. لێ ئەز ئەخمەخ نینم؟ سلاڤ یا من نینە؟ وەکی زارا یەك ئانی سەرێ من؟».

هەڤالێ وانی سسیا گۆت: «ناخێر، سلاڤ ـ سلاڤا منە، بێ ئەخمەخ ژ ی ئەز خوەخوەمە». هەڤالا ژ ی گۆت: «تو ژ ی گلییێ خوە مەڕا شرۆڤەکە». ئەوی گۆت: «زانینا من زانم ژنامن یار بوو. ژنامن ئێڤارەکی مڕا گۆت: «سبێ بزنا مە بڤە بازارێ بفرۆشە». مڕاگۆت: «بزنێ بدە سێسد ماناتی، مڕا بکرە دیوەکی، جۆتە سۆلی، شەکی سەرییا ئوگەلە تشتێ مایین». ژنا من مڕا گۆت: «تێ هەڕی بازارێ، موقاتی خوە بە تو ئوندا نەبی». من ژێرا گۆت: «عەڤدا خوەدێ، ئەزێ چاوا بازارێ ئوندا بم؟» ژنا من مڕا گۆت: «ژ حەزارا مەری تێنە بازارێ، تێ ناڤاواندا بی». من ژێرا گۆت: «عەڤدا خوەدێ، لێ ئەز چا بکم، وەکی بازارێ ئوندا نەبم؟». ژنا من گۆت: «وەرە ئەز پینەکی سپی پشتا تەڤا بدرووم، هەرکێ تو خوە بازارێ ئوندا دکی پارا پشتا خوە بنهێرە، وەکی پینێ سپی پێڤا بوو، ئوسا زانبی، تویی لێخی بێ بی مال». من گۆ «برا خەبەرا تەبە». ئەز سبێ شەبەقێ ڕابووم، بزنا خوە بر بازارێ من ژنا گازی یارێ خوە کر، بزنەك ژ ی دا یارێ خوە، چ تەمی ل من کربوو ئەو تەمی ژ ی یارێ خوە کربوو، پینەکی سپی ژ پشتا یارێ خوەڤا درووتبوو. وەختەکێ من دینا خوە دا یەك وێ پێشییا من دچە، بزەنەکە پاشییا وی یە پینەکی سپی پشتا ویڤا درووییە. ئەز خوەڤا دوشورمیش بووم، م گۆ: «ئەوێ هان ئەزم. لێ ئەز کیمە؟ وەکی ئەز ئەزم، لێ ئەوێ پێشییا من کییە؟». من گۆ، دڤە من خوە ئوندا کرییە»؟ ئەز گەلەکی

دوشـــورمیش بووم. من گوْت! «هـەرکیْ ئەوی بزن فروْت دا سێســد مانــاتی، چ تەمی‌یی من من کری‌یــە، وەکی ئەوی گشـك کری بزانبــە ئەوئەزم، وەکی ئەوی بزن نەفـروْت، ئەو تەمی‌یێ ژنـا من نەکـری بزانبـە ئەوئەز نینم، ئەز ژ ی ئەزم». گەلی هەڤـالا ئیـدا ئەز بوومـە قەرەولێ وی مێـرکی، پەی وی مێرکی دچم مێرك بزنا خوە دا سێسد ماناتی چ تەمی‌یێ ژنا من کربـــوو ئەوی گشـــك کری من گوْر: «جـانم ئەوئەزم لێ ئەز کیمـــە؟ ژنـــا من چ تەمی م کری‌یـــە من تەڤ کری». جارەك مایین ئەز خوەڕا دوشـورمیش بووم: «هەرکیْ ئەوچوومالا من بزانبـــە ئەوئەزم، ئەز ژ ی ئەز نینم». من دا پەی وی مێـرکی. ئەومێرك ڕاست چوومالا من. دەست ستوْیی ژنا مرا بر، گوْ: «عـــەڤـدا خوەدیْ تە چ تەمی من کر من تەڤ کری». من گوْ! «جانم ئەوئەزم، لێ ئەز کیمە؟ ئەز خوەڕا مامە شاش، خوەڕا وان دنهێـــرم. من دەری ڤەکـــر چوومـــە هونـدوور. من گوْ: «خوشکیْ، ئەز ڕێویمە، ئیشەڤ جیکی بدە من حەتا سبیْ ئەز هەرم». ژنـا من گوْ: «کـەرەم کە وەرە هەرە ئوْدیْ». من دەریْ ئوْدا خوە ڤەکر ئەز چوومە ئوْدیْ. من دینا خوە دایێ دوو حەڤیْ عەجەم تێدا روونشتبوون ئەوژ ی هاتبوونە مێڤانی. ئەز چووم خوەڕا کێلەکا وان ڕوونشتم.

ژنـــا من مەڕا ئێڤـاریْ شیڤ ئانی، مە نانیْ خوە خوار. من گوْتـە ژنـا خوە! «خـوشکیْ، ئەزیْ ڕێـویمە، ڕییا من دوورە، ئیشـــەڤ زوو دەین م کی، وەکی ئەز هەرم ڕییـا خوە بقـەدینم هەلە هێ ڕوْ دەرنەکەتبە». ژنا من مرا گوْت: «تو خوەڕا ڕازێ، ئەزیْ زوو دەیـــن تەکـــم». من سەریْ خوە دانـــی ئەز خوەڕا ڕازام. نزام ئەز گەلـــەکی ڕازام، هنـدکی ڕازام ژنـا من هات دەین م کر، گوْ: «قـوربـا، ڕابـە تو ڕێـوی‌یی ڕابە هەرە». ئەز خەویْ ڕابووم، من چەعڤیْ خوە مزدا شەڤە هیڤرۆن بووشەوقا هیڤیْ دابـوو ناڤ مالیْ، م ژ ی تریْ ئیـدی سبە زەلال بوویە. ئەز لەز ـ لەز ڕابـــووم کنجیْ خوە زوو ـ زووخوەکـر، کومیْ من ژ ی کێلەکـا پاراخیْ عەجـەماڤا دیوێرڤا درداکریبوو. ئەز ئوسا لەز کەتـم، وەکـی من دەوســا کومـیْ خوە م کومـیْ عەجـــەم دارســـەریْ خوە. من هەسـپـیْ خوە دەرخســـت، زینـیْ وێ لێ کر، تەنگ ـ بەریْ وی شداند، خاتریْ خوە وان خاست،

ئەز سیاربووم. پڕ چووم هندك چووم وەختەکیْ هیڤ زڤری سیا من کەتە پێشییا من، سیا خوە نهێری، م گوْ: «جانم، ئەڤا سیا عەجـەمـایـە، پاراخیْ سەریْ وی ئەوڤـا درێژە». من خوەخوە خوەڕا گوْت: «عەجەم ڕابوویە سەر ڕێ کەتی‌یە، ئەز ژ ی مامە مالدا ڕازایی، ئەزە ڤەگەڕم برا عەجە ڤەگەڕە مال ڕازێ، ئەزیْ ڕابم هەرم».

ئەز پاشـــدا ڤەگـەڕیـام هاتمـە مال، من گوْ: «خـوشکیْ، خوشکیْ». ژنـا من دەرکـەتە دەرڤا، م گوْ: «خوشکیْ خوەدیْ تەڕا، من تەڕاگوْت تو، دەین من کی، تەڕابوویە دەین عەجەم کری‌یــە، عەجــەم سەر ڕێ کەتی‌یــە ئەز ژ ی مامــە مالـــدا ڕازایی». ژنـا من گوْت: «عـەڤدێ خوەدێ، توچ دڤێژ ی، تو دین بوویی، تیْ کودا هەڕی، خوشکـا چ، نە ئەز ژنـا تەمـە، توییْ کودا هەڕی، ئەڤا مالا تەیە؟ من شەرما نزانبووچ بگوْتا، تشتێ من دا بەر ڕوویێ خوە، من گوْ: «من تریْ خەونە». ئەز دڤینم گەلی هەڤالا سلاڤ یا منە».

هەڤـالا گوْ: «هـەرە ئەخمـەخی ژ ی تە حەلال بە، سلاڤ ژ ی تە حەلال بە».

فە رهەنگوْك

---

ڕێوی: ڕێبوار، ڕێڤینگ

ڕێڤا: لەڕێ / سیار: سوار / خوْرت: لاو، کوڕ

وان دەرباز بوو: لەوان تێپەڕبوو

قرك: قورگ، قرقراگە، قوڕقوڕاگە، کرکراگە، بەربینگ، ناقرە

سیا: سێبەم / قوربا: قوربان / هێ: هێشتا

کازیکنێ: گازی‌کەینێ، بانگی‌کەین

برا: با، بلا

چکا: کیهە، کیهە، کام

کیژانی: کام

جەم وان: کن وان، لای‌ئەوان

خاتریْ ناڤێ خوەدێ: بوْ خاتری ناوی‌خودا، بەشقی نێوی‌خودا

دوشورمیش بوو: بیری کردەوە

هەڕن: بڕوْن

ئەخمەخ: ئەحمەق، گەلوْر، گەمژە

ئوْخر: ئوغر

ناکا: ئێستاکە، نهاکا، نهۆکا، هەنووکە
دەن: کووپەی خم
هوندوور: ژوورەوە
حەوز: گۆم، گۆل
هەڤە ـ تونەڤە: هەبێونەبێ
ویخی: لەو بدەی، لێیدەی
مێرکوت: کوتەك، مێکوت، گالۆك، تۆبز
ڤردام: ئێرە / وێدا: ئەوێ
قووژین: قیژە، زریکە، وژە / تونە: نیە
ڕەشیڤەهات: تاریك داهات
کێل: تەقەڵ؟
تەو، تەو: ئاهمم، حەو، تهۆ
شرۆڤە: شەرح
شاگرت: شاگرد، قوتابی
دەرسخان: قوتابخانە، فێرگە
دەرسدار: مامۆستا
چەعڤ: چاو
حەتانی: هەتاوەکو، هەتا
تاب: توان، تاو، تاوشت، تاقەت
گلی: قسە
سەیدا: مامۆستا
چقا: چەند
ڕەنگ ئاڤیتی‌یە: ڕەنگی‌پەڕیوە، ڕەنگ وڕووی پێ‌نەماوە، ڕەنگی زەردهەڵگەڕاوە.
حێسا: حەسانەوە
برژە: برژێ، کوێربێ
قودومێ چۆك: قەڵەمی ئەژنۆ
مایین: دوایی، دووهەم، تر
دڤە: دەبێ، دەڵێ
زار: منداڵ / دەرەو: درۆ / هوون: ئێوە
نیبووم: نیم، نەبووم
گوراگلیێ زارکر: بەگوێی منداڵانم کرد، بەقسەی منداڵانم کرد. / مرا: بۆمن
دکەلی‌یان: دەکوڵان
شەعلك: شاڵۆك، شاڵ

هێسر: فرمێسك
پاقش: پاگژ، پاك، پاقژ
گەلوگری: بەگەرووی پڕگریانەوە، پڕقوڕگی بیوو لەگریان
دێر: جیرە
دشەوتینە: دەسووتێنێ
ئالی: لا
خودان: ئارەقە
گەپ: گوپ، هێورد
ئۆرخان: ئۆرغان، لحێف، لێفە
وەڕمین: ئاوسان، هەڵمسان، پەنمان، پەنەمیان
ڤەڕووت: ڕووتاندەوە
خا: خاوەند، خێو
گەوری: گەری، گەروو، گەڵوو،
گووزان: گوێزان
عەڤد: عەبد
ئوندابوون: ون بوون
سێد: سێسەد
قەرەول: پاسەوان، جاسووس
گشك: گشت / تەڤ: هەموو
مێرك: پیاو / نینم: نیم
حەڤ: چەنددانەیەك، یەکدوو (حەڤ) دانە، دەنك
کێلەك: تەنیشت
شیڤ: شیو، نانی ئێواری، شام
دەین م کی: بەخەبەرم بێنی
دەین کرن: وەخەبەرهێنان
هیڤ: مانگ / هیڤرۆن: مانگەشەو
ژڤرین: گەڕانەوە / ڕازان: نووستن
سێ: سبەیەر / مزدان. سەرنج دان
زەلال: ڕوون / لەر: خێرا، توورج
کنج: جلك، بەرگ
کوم: کلاو، شەپقە
پاراخ: کلاوی قووچی عەجەم، پاپاخ، قەرەپاپاخ، کلاوڕەش. جورە تورکیکی ولاتی ئازربایجانن.
ئەوقا: ئەوەندە، هێندە، ئەوقاسی
ترێ: دەڵێی. ترێخەونە: دەڵێی خەونە.

# ژستڕانێت داوەتێت کوردی

نڤیسینا: یاسین زێباری

«زۆرزان»

سترانا: حەدوشنی

زۆرزان جۆتن جۆتن
لێ لێ زۆرزان لێ لێ زۆرزان
پسەر مللادا دگوتن
لێ لێ زۆرزان لێ لێ زۆرزان
ڤا پە زەریا لاڤ سۆتن
لێ لێ زۆرزان لێ لێ زۆرزان
کەوێ جانێ

× × ×

زۆرزان سێنە سێنە
لێ لێ زۆرزان لێ لێ زۆرزان
پسەر مللادا تێنە
لێ لێ زۆرزان لێ لێ زۆرزان
چەند سالا لهیڤیێ مە
لێ لێ زۆرزان لێ لێ زۆرزان
کەوێ جانێ

× × ×

زۆرزان چارن چارن
لێ لێ زۆرزان لێ لێ. زۆرزان
پسەر مللادا دبارن
لێ لێ زۆرزان لێ لێ زۆرزان
کچ بۆ هندە دژار ن
لێ لێ زۆرزان لێ لێ زۆرزان
بۆ لاوا بریندارن
لێ لێ زۆرزان لێ لێ زۆرزان
کەوێ جانێ

× × ×




زۆرزان کەلـیـا بەفـرێ
لێ لێ زۆرزان لێ لێ زۆرزان
لبـن بەفـرێ ئاڤـا لێ
لێ لێ زۆرزان لێ لێ زۆرزان
بەرێ وێ کەفـتـە رێ
لێ لێ زۆرزان لێ زۆرزان
کەوێ جانێ
× × ×

زۆرزان چەنـد تسـارن
لێ لێ زۆرزان لێ لێ زۆرزان
بەفـرو باران لێ دبـارن
لێ لێ زۆرزان لێ لێ زۆرزان
کەوێ جانێ
× × ×

«زەككیا»

زەکـکـیـا کولـیلکـا لسـەرێ چیـا
پەز کویـڤـی لێ چێـری یا
زەکـکـیـا کولیلکـا لدەرگـەلی‌یـا
من چانـدۆ لدەف کانـیـا
× × ×

من دیـت و لبـەر من بوری
تە کوشـتـم پخـورتـی‌و زۆری
سیـنـگـێ تە زەروە پر مۆری
لبـەر دلـێـمـن هەرتـوی حوری
× × ×

بێـری چۆنـە گـەلـی یا
دەردۆ یەمـمـان زەکـکـیـا
کورچـۆنـە ناڤ زەری‌یـا
ئەز مام لگـەل هیـڤـی‌یـا
× × ×

ئەز دێ کرم دێ کریارکەم
سەر بە زێرا دێ بازار کەم
هەکیا جوانە دێ لخۆ مارکەم
بەژنا دۆتمام ئەز دێ کار کەم
× × ×

ئەزێ مای وگایێ بەلەك
ئەز دێ مینم دێ هزرینم
رۆندکا لچاڤێت بەلەك دێ بارینم
ماچ نینە خەمێت خۆ .. پێ برەڤینم
× × ×

ئەزێ مای‌و قانا رەزی
ژارو ئەزۆ قانا رەزی
ئەویش من دا مەلاو قازی
هەتا دۆتمام بێژیت رازی
× × ×

ئەزێ مای‌و تیا خەنجەرێ
هەتا دۆتمام دبێژیت هەرێ
ئەویش من دا پشتە دەرێ
دا دۆتمامێ بیننە دەرێ

كتێبی بەیان

# گۆرانی و هەڵپەرکێی فۆلکلۆری کوردی

وەرگێرانی: حسین احمدجاف

ئارکیۆلۆژیستی جیهانی ناسراوو بەناوبانگ مستررالف ـ ئیس سۆلیکی..

چەن جارێك هاتۆتە وڵاتەکەمان وتەنانەت هێندێ بەرهەمی مێژوویی بەنرخی لەسەر نوسیوەتەوە.. بەمەش نەوەستاوە بەڵکو زیاتریش چۆتە لادێکانی کوردستانی رەنگاورەنگ و چەن شریتێکی گۆرانی فۆلکلۆری رەسەنی کوردی تۆمار کردووەو لە وڵاتانی دەرەوە بڵاوی کردونەتەوە.. بۆ نموونە ئەم زانایە کتێبی [یەکەم نیشتمانی گوڵان]و پەرتووکی [گۆرانی و هەڵپەرکێی کوردی]و چەن کتێبی دیکەشی لەسەر گەلی کورد هەیە..

لە کتێبی یەکەمدا... ئەو راستییەی سەلماندووە کە یەکەم مرۆڤ.. کە مرۆڤی نیاندرتال بووە لەو شوێنە گیرساوەتەوە کە ئێستا بە کوردستان ناسراوە...(35) هەزار ساڵ بەر لەدایکبوونی حەزرەتی عیسا پەیدابووەو شارستانیەتێکی سەرەتایی دامەزراندووەو باخچەی گوڵی جوان و رەنگاورەنگی بۆ خۆی رازاندۆتەوە... جگە لەمەش سۆلیکی ئەوەی سەلماندووە.. کە تەنها بۆ جوانی و بۆن خۆشی ئەو مرۆڤە گوڵی نەچاندووە بەڵکو بۆئەوەی چاندووە کە بتوانێ تیماری نەخۆشی و دەردی پێ بکات.. وەك فارماکۆلۆژیەکی سەرەتایی ...واتە [علم تصنیع الادویه.].

سۆلیکی ساڵی (1953) زاینی هاتۆتە عیراق و بەسەرۆکایەتی لیژنەیەکی مێژوویی چۆتە ناوچەی شانەدەر. ئیشی سەرەکی ئەو لیژنەیە پشکنین و تاقیکردنەوەی شوێنە مێژووییەکانی ناوچەی شانەدەربووە بەتایبەتی و کوردستان بەگشتی کە هەر لە دێرزەمانەوە.. وەك مێژوو بۆمانی دەسەلمێنی مەڵبەندێکی هەرەکۆنی شارستانییەت بووە. لەپاڵ ئیشە مێژووییەکەی پرۆفیسور سۆلیکی بەزیتەڵی و ووریایی خۆی توانیویەتی گەلێ تێبینی بەنرخیش لەبارەی موسیقاو گۆرانیی میللی و هەڵپەرکێی کوردی کۆبکاتەوە... کە وەك خۆی لەپێشەکی ئەم پەرتووکە خنجیلانەیە دەڵێ:ـ

ئەم گۆرانیانەی کە لەم پەرتووکەدا تۆمارم کردوون.. لەدەمی ئەو کرێکارەکوردانە وەرم گرتوون کە لەگەڵ لیژنەکەماندا ئیشیان دەکرد.. هەروەهاش هەندێکم لە پۆلیسە کوردەکانی مەخفەری دۆڵی شانەدەر وەرگرتوە.. جگە لەمانەش دوو کورە شێخی ناوچەی پاتاسی کە ئەکەوێتە خوارووی شانەدەرەوە.. ئەو دوو شێخزادە بەرێزانەش ...گەلێ یارمەتیان دام لە تۆمارکردنی چەن گۆرانیەك ئینجا سۆلیکی لەپاشی ئەوەی سوپاسی ئەوانەی* کە یارمەتیان داوە لە تۆمارکردنی ئەو گۆرانی و ئاوازە کوردیانە.. سوپاسی خوالێخۆشبو ئەندازیار (بکردلیر) دەکات.. کە دەقی ئەو گۆرانیە کوردیانەی بۆ نوسەر خستۆتە سەر زمانی ئینگلیزی.. نوسەر وەك ـ خلفیە ـ یێك بۆ ئەو گۆرانیانە.. هەندێ زانیاریشی لەبارەی کوردان.. ئامادە کردووە بۆ ئەوەی لەگەڵ قەوانی ئەو گۆرانیانە لە جیهاندا بڵاوبکرێنەوە وە لە لاپرە (4) نوسەر بەم جۆرەی لای خوارەوە باسی میوانداری لەناو کورداندا ئەکات و ئەڵێ:ـ

کورد ...میوانپەرستن و ئەوەی لابداتە لایان بەئەوپەرریزو قەدرەوە خزمەت و میوانی دەکەن.

سۆلیکی کە باسی گۆرانی کوردی دەکات بەم شێوەیە.. باسی دەکات

گۆرانی کوردەکان ...لەگەڵ شتە شمولی یەکاندا مامەڵە دەکەن وەك ئەڤین و دڵداری و جەنگە ئەفسانەییەکان. ئامێرە موسیقاییە کوردیەکانیش ئاسانن و بریتین لە جوزەلەو دەهوڵ و زورنا... شیاوترین شوێن بۆ ووتنەوەی گۆرانی کوردی وەك ـ سۆلیکی ئەڵێ دۆڵە هێمنەکانی ناوچەی کوردستانە.. لەو شوێندا سیحری ئاواز لەگەڵ جوانی سروشتی رەنگاورەنگی کوردستاندا... سیمفونیەکی هەرەدڵگیر پێك دەهێنن و هەست ونەست خەڵکەکە ئەخەنە جۆشس وخرۆشەوە... گۆرانی کوردی نەك تەنها فۆلکلۆری کوردەواری پاراستووە بەڵکو زیاتریش توانیویەتی خۆی لە کارتێکردنی ئاوازە بێگانەکانیش بپارێزێ (لاوك)و (حەیران)یش دوو جۆری رەسەنی ئاوازی کوردین.

دوای ئەوە... سۆلیکی دێتە سەر باسی هەڵپەرکێی کوردی و

ئەڵێ :-

ئەم هەڵپەرکێ یە.چالاکی یەکی ئەمەندە خۆشی و رەنگاورەنگە ..تارادەیەك مرۆڤ خونی بێ رانا گیرێ ..کە چاوی لی بی بوو و هەر ئەبێ بچێتە ریزی بەشداریکەرانەوە ولەگەڵ ئەو ئاوازە خۆشانەدا ... سەما بکات

جا بۆئەوەی وێنەیەکی زیندوو بە خوێنەر بگەیێنێ لەبارەی گۆرانی کوردیەوە بەم شێوەیەی لای خوارەوە... گۆرانی کوردان هەڵئەسەنگێنی..

گۆرانی لەناو کورداندا بێ چێژوك نابێ.. چونکە گۆرانی یەکانیان ..ئەنجامی تاقیکردنەوەیەکی هەستی ی تایبەتی و راستەقینەیە.. بۆیە کە لە لێوان دەرئەچن لەناو دڵدا جێگەی خۆیان ئەکەنەوە.. ئەم دیاردەیەش هێندێکی ئیقناعی گەورەتر ئەداتە پاڵیانەوە.

جا با چەن نموونەیەکی وەرگێراوتان بۆ بخەینە پێش چاو.. لەوانەی ..کەلەم پەرتووکەدا تۆمارکراون.. هەرچەن بەداخەوە دەقە ئەسڵی یە کوردیەکانیانمان لەبەر دەستا نی یە.. بەڵام بگوێرەی توانا.. توانیمان خۆمان بدەینە قەرەیانەوەوچەن دانەیەکیان دیسانەوە بخەینە سەر زمانی کوردی ..ئەمانەی لای خوارەوەچەن دێرێکی هەڵبژێراون لەو گۆرانیانە.

مەمانت جوتێ هەرمێ ..تازە پێ گەیشتوون
سنگت باخێکە لە شاری مەریوان
ئەو جووتە هەرمێ یەی وا بەسنگتەوە
ئەترسم - من - لێیان نزیکبمەوە
خۆزیا ئەبووم بە قۆپچەی کراسەکەت
تا دەستم بگاتە هەرمێ ی باخەکەت

ئینجا نوسەر لەم گۆرانیە دەکۆڵێتەوە ودەڵێ وام بۆ دەردەکەوێ کە گۆرانی خۆشەویستی لەناو کورداندا هیچ سنوورێك نازانێ ودان بەهیچ کۆسپێك نانێ... چونکە لەوە ئەچێ کە دانەری ئەم گۆرانی یە.. تاقیکردنەوەیەکی فراوان و بەرینی هەبێ لە بواری عیشق و دڵداری و جوانناسی داو مەیلێکی فیطری بۆ هەبێ.. چونکە خەریکی براووردکردنی جوانی کچانی گوندە دوورەکانی کوردستانەلەگەڵ جوانی کچانی سلێمانی و دیانا دەکات.. کە زۆر جوانن بەڵام دڵ رەقن و رەحم بەحاڵی دڵ بریندارێکی لێقەوماوەوەك ئەو ناکەن.

دوای ئەوە.. نوسەر باسی ناوەرۆکی حەیرانێکمان بۆ ئەکاتەوەو ئەڵێ:.

ئەم حەیرانە باسی گەنجێك دەکا حەز لە ئافرەتێکی شووکردوو دەکات. ئەو گەنجە.. ئەچێتە لای مەلای دێکەیان بۆ ئەوەی نوشتەیەکی بۆ بنووسێتەوە بەڵکو.. زەنگی دڵی خۆشەویستەکەی هەمیشە بۆ ئەو لێ بدات.. هەرچەندە هەوڵەکانی ئەو گەنجە بەفیرۆ چوون چونکە دڵدارەکەی هەر هێشتا ژنی کابرای پیرەمێردە بەڵام کورە لەگەڵ لەئەوەشدا هێشتا هیوا بڕ نەبووەو بەتەمای ئەوەیە رۆژێك بەدیداری ئافرەتە شۆخە شادبێتەوەو بەڵێنەکەی بەجێ بهێنێت بۆ ئەوەی بەیەکتر بگەن لەدەشتی دزەیی...

وەلە کۆتایی کتێبەکەدا ..نوسەر دەقی گۆرانیەکی میللی کوردیمان بۆ تۆمار دەکات کە بەشێوەی کرمانجی ژووروو وتراوەتەوەو ئەڵێ کە ئەم گۆرانیە لە دوو کورە شێخی بیستووە.. بێ ئەوەی ناویان یان ناوی باوکیان بهێنێ ..کە شێخێکی ئاینی پایەبەرزبووە.. وەك خۆی دەڵێ گۆرانیەکەش بە ناوی (ئامینێ) ئەبێ .ئەمەش دەقەکەیەتی :-

نەختێکی کەش ..گۆرانیم بۆ بڵێ
دڵت بکەرەوە ..تەنها بۆ چەن رۆژێك
چونکە بێ تۆ ژیانم نی یە
ئەم وەرزە.. وەرزی زستان نی یە.. وەرزی بەهارە
بەڵام ئاخ ..ناتوانم قسەی لەگەڵدا بکەم
تەنانەت ناشتوانم پێی بڵێم مەرحەبا
چونکە دایکە عەیارە دڵ رەقەکەی
بەشەوو بەرۆژ چاودێری دەکا

لەم پەرتووکەدا ...دەقی حەوت لاوك و حەیران و بەستە تۆمارکراوە لەگەڵ کورتە باسێك لەبارەی گەل کوردو ناوچەی کوردستان .ئەم پەرتووکە لەگەڵ قەوانی ئەو گۆرانیانە دەرچووەو لەلایەن دەزگای [ Folkways Records ] and Service Corporation ..وە .کە مەڵبەندی شاری نیویۆرکە... بڵاوکراوەتەوە شایەنی باسە ئیشی ئەم دەزگایەش ناساندن و دابەشکردنی گۆرانی کەلەپووری میللەتە جۆراوجۆرەکای جیهانە... ئیتر بەم شێوەیە... گۆرانی گەلی کوردمان ..بە میللەتانی تر پێشکەش کرا.. بە هەوڵ وکۆششی ئەو ئارکیۆلۆژستە جیهانیە..

# سیناریۆی دووکەس لەگەڕەکێکدا

نووسینی: نازم حیکمەت

نازم حیکمەت ئەم سیناریۆیەی لە ساڵی 1956دا بە رووسی نووسیوە
بهرام ئوغلی کردوویەتی بە تورکی.

لە کتێبی: - NAZIM hikmet YaYinlanmamis Eserler کراوە بە کوردی

احمد محمد اسماعیل

## بەشی دووەم

حلیمە: (شڵەژاو دیارە شەرم دایگرتووە)، هاوار هاواری چیتە؟

احمد: داوای لێبوردنت لێ دەکەم بگرە (شووتییەکەی بۆ درێژ دەکات).

حلیمە: پارەکەی چەندە؟

احمد پێدەکەنێ. بەدەست ئیشارەت دەکات، پێنج، پێنج، دەی‌تری. حلیمە شووتییەکە وەردەگرێ‌و لە سەر قومەکە دایدەنێت. هەندێ پارە لەدەسەسرێکدایە دەریدێنێ‌و بۆ احمدی درێژ دەکات. احمد بەپێکەنینەوە پارەکەی لێ‌وەردەگرێت. حلیمە دادەنەوێت شووتیێ کە هەڵبگرێت. احمد زووتر دێتە دەست بەر لە حلیمە شووتێکە هەڵدەگرێت.

حلیمە: داینێ. شووتی شووتی منە.

احمد: نابێت من هەڵیدەگرم.

حلیمە تەماشای دەوروپشتی خۆی دەکات.

حلیمە: (بەراستێتی) وەرە با دوو قسە لەگەڵ یەکتردا بکەین.

احمد: بەڵام با بچینە ناو ئەو بەلەمەوە.

حلیمە دووبارە بەملاو بەولادا چاو دەگێڕێ.

حلیمە: با وابێ.

احمد بەڵەمە بۆن لێ‌هاتووەکە رووەو ناو دەریاکە پاڵ دەنێت. حلیمە پۆتینەکانی فری دەداتە نیو بەلەمەکەوە. دەچێتە ناو ئاوەکەوە. خۆشی لەدوایەوە باز دەداتە ناو بەلەمەکەوەو دەست دەداتە سەوڵەکان.

**حليمه**: دەزانی باوکم رقی لێتە.

**احمد**: ئەی تۆ؟

**حليمه**: بە بێ کارێکی بێ دەسەلاتت لەقەڵەم دەدات.

**احمد**: ئەی تۆ؟

**حليمە**: لەگەڵ تودا قسەکردن و هەڵسان و دانشتنی لێ قەدەغە کردووم.

**احمد**: بابیبینم.

**حليمه**: بۆ؟ هیچ پێویست ناکات. دەگەڕێمەوە..

احمد خیراتر سەوڵ دەوەشێنێ.

**حليمه**: پێت دەڵێم دەگەڕێمەوە.

احمد بەرەو قولایی دەریاکە سەوڵ دەوەشێنێ.

حليمه پۆتینەکەی بەشانا دەکات.

**احمد**: حليمه... دەزانی من...

حليمــە هەڵـدەستێ، خۆی فرێ دەداتــە ناو ئاوەکـەوەو بەرەو کەنار دەروات.

**احمد**: خۆشتم ئەوێ..

حليمه ئاوڕ ناداتەوە. احمد شووتێکەی بۆ هەوا دەدات.

**احمد**: شووتێکەت لە بیرچوو.

حليمه ناگەڕێتەوە... دەروات.

**احمد**: دەبێ هەر باوکت ببینم.

لەدوو پەنجـەرەوە رووناکی دیـارە، هەندێ جار تارمایی لەو دیو پەردە سپی‌یەکانەوە دەبینرێن.

**دەنگی عزیز**: ئەوانە پەنجەرەکانی ماڵی ئێمەن. کوبوینەتەوە.

بریارمان لەسەر ئەوەدا گۆڤارێك دەرکەین.

ناومـــان لێ‌نــا «رووناکی» نوری بەســەر نووســەرو خاوەنی گۆڤارەکە بێت.

احمدو نوري لە ماڵی عزیزەوە دەردەچن و کەیفیان خۆشە.

**احمد**: پیرۆز بێت برا.

**نوري**: کاتی پیرۆز بایی نییە هێشتا. بێ‌پارەین..

**احمـد**: دەبێت، سبـەی دەڕۆم بۆ گەڕەکـەکـەمان. دوکتۆر عزیز دێت تۆش وەرە.

هەردووك ئاور دەدەنـەوەو تەمـاشـای پەنجـەرە رووناکەکانی ماڵی عزیز دەکەن و پێدەکەنن.

**احمد**: دەڵێن لە فرەنساوە ناردویانە بە شوێنیا.

**نوري**: لەبەرچی؟

**احمد**: بۆ ئەوەی لە نەخۆشی دڵ شتێکی نوێی دۆزیوەتەوە.

**نوري**: ئێ دەروات؟

**احمد**: ناڕوات:

**نوري**: ناڕوات؟

**احمد**: بەڵی. وابزانم دەیەوێ لێرە بمێنێتەوە.

**نوري**: دوکتۆرێکی شارەوانی هەژار حەز بەمانەوە دەکات. وانییە؟

**احمد**: تۆ دڵی خۆت سەغلەت مەکە. پارە پەیدا دەبێت.

بەیـانی‌یـە. حەســەن لەســەر کانی‌یەکە راوەستاوە، پیرو هەژار دیارە.

**احمد**: مەرحەبا.

حەسەن، بەر بەولاوە دەکات و وەرامی ناداتەوە.

**احمد**: ئێشم پێتە.

**حەسەن**: لە نێوان من و تۆدا هیچی وا نییە قسەی لێوە بکەین.

**احمد**: بۆ وا هەموو شتێك بەپێچەوانەوە تێ‌دەگەی؟

حەسەن رووی خۆی وەردەگێرێ‌و قسەناکات.

**احمد**: لە خۆڕایی وا لە خۆت دەکەی پیرەمێرد.

(دەرواتە دوکانەکەی فەیزی‌یەوە).

حەسەن لەپشت احمدەوە تفێك دەکات.

دوکـانــەکـەی فەیزی، پیرەژنێك و حلیمەو فەیزی بەلای دەزگاکەوە راوەستاون.

احمد بە تەنیشت حليمەوە رادەوەستێ.

**پیرەژنەکە**: (بەدەم گیریانەوە): مرد.. وەك پەپوولە هەڵفڕیو ڕۆیی.. بەجۆری دوکتور عزیزیش فریای پیاوەکەم نەکەوت.

ئافرەتەکە دەدواو فەیزی خامی دەپێوی.

**فەیزي**: (دەنگی درێژ دەکاتەوە). شەش مەتر.

**پیرەژنەکە**: کفن شەش مەترا!.. با پێنج و نیو بێ پارەمان نییە.

**فەیزي**: دواجا بیدە (**خامەکەی دەداتە دەست**) بگرە.

پیرەژنەکە کفنەکە دەخاتە سەبەتەکەیەوە. فەیزی ڕوو لە حلیمە دەکات.

**فەیزي**: تۆ چیت دەوێ کچم؟

**پیرەژنەکە**: **خوشبی فەیزی (بەگیریانەوە دەردەچێ)**

**فەیزي**: لە ڕۆژێکی سەخت و ناخۆش داین.

**احمد**: ڕۆژێکی شووم.

**فەیزي**: دەبڵێ حەلیمە.

حلیمە بێدەنگەو تەماشای احمد دەکات.

**احمد**: من پەلەم نییە، چیت دەوێ تۆ بیڵێ.

حلیمە هەر خۆی بادەدا.

**فەیزي**: دەبڵێ دەی بزانم چیت دەوێ.

**حلیمە**: (بەتیلەی چاو تەماشای احمد دەکات):

باوکم دەڵێ با مانگێکی کەش لەسەرمان سەبرکات.

**فەیزي**: نابێ.

**احمد**: هەر نەبێ دوو هەفتە مۆڵەتیان بدە.

حلیمە سوور هەڵدەگەڕێ. بەرقەوە تەماشای احمد دەکات.

**فەیزي**: باشە وا دوو هەفتە مۆڵەتم دا.

**حەلیمە**: (بەفەیزی): سوپاستان دەکەم (خێرا لە دوکانەکە دەردەچێ.

**احمد**: کچەکەت پەشیمان کردەوە.

**فەیزي**: دەنگ و باسی ڕۆژنامەکە گەیشتە چی؟

**احمد**: خراپە.. ئەوەی توانیم کۆی بکەمەوە ئا ئەمەندەیە (هەندێ خوردەی پیشان دەدات).

**فەیزي**: (جمێن دەدات) کەمە.

**احمد**: کەمە..

فەیزی بێئەوەی شتێك بڵێ لەپشت تابلۆیەکەوە کە بە دیوارەکەوە هەڵواسراوە، هەندێ پارە دەردێنێو بە احمدی دەدات. احمد خوردەکانی دەخاتە سەر بانگە نۆتەکانی فەیزییەوە.

کۆڵانێك لەناوەڕاست شارەکەدا.

**دەنگی عزیز**: ئا لێرانەدا ڕۆژنامەو گۆڤاری ئەم شارە لەچاپ دەدرێت.

خانوویەکی کۆنی گەورەی چڵکن. کامیرا لە سەرەوە تا خوارە پیشانی دەدات. قاتی یەکەم.

**دەنگی عزیز**: ئا لێرەدا ژوورێکمان بەکری گرت بۆ «ڕووناکی». ژوورێکی بچوك. مێزێك نیوەی ژوورەکەی گردوتەوە. نوری لە پشت مێزەکەوە دانشتووەو خەریکە. چەند کەسێك لە ژوورەکەدایە.

هەمان ژوور شەوە. نوریو احمد کاردەکەن. احمد چاکەتەکەی بەسەر ئەو کورسییەدایە کە لەسەری دانیشتووە..

**نوري**: (ووتارێك دەداتە دەست احمدەوە). دەڵێ وەزیری ئابوری تورە دەبێت؟.

**احمد**: ووتاری چاکە.

دەنگی شکاندنی شووشە. بەردێك دەکەوێتە ژوورەکەوە نوري دادەچەڵەکێ. احمد بەردەکە لە زەوی هەڵدەگرێت.

دەروات بۆلای پەنجەرە شکاوەکەوە. گوێی لە ترپەی

پی یەك دەبێ بەراکردن دوور دەکەوێتەوە.

احمد بەردەکە لەگیرفانی دەنێت.

ماڵی حەسەن. ژوورێك. ژوورەکە فەنەری کۆڵانەکە ڕۆشنای کردوتەوە. حلیمە لەدەر پەنجەرەکە دانیشتووە. پەنجەرەکە دەڕوانێتە سەر کۆڵانەکە. دەنگی ترپەی پی یەك بەرەبەرە نزیك دەبێتەوە.

حلیمە لەپارچە کاغەزێکدا چەند شتێك دەنووسێ.

کۆڵانەکە. احمدو نوری لە پەنجەرەکەی ماڵی حلیمە نزیك دەبنەوە.

حلیمە لە پەنجەرەکەوە بە چرپە:

**حلیمە**: احمد...

احمدو نوری، لەبەر پەنجەرەکەی حلیمە رادەوەستن حلیمە پارچە کاغەزەکەیان بۆ فرێ دەدات احمد پارچە کاغزەکە لەزەوی هەڵدەگرێت.

ژوورێك لە ماڵی حەسەن. حەسەن لەبەر دەرگاکەوە راوەستاوە

**حلیمە**: (حەسەن نابینێ) بیخوێننەوە.. بۆ ئێوەم نووسیوە.

**حەسەن**: (بە حلیمە) ئەوە لەگەڵ کێدا قسەدەکەی؟

لاچۆ! (پەنجەرەکە پێوە دەدات) بێ شەرمینە.

کۆڵانەکە. نوریو احمد لە پەنجەرەکە دوور دەکەونەوە.

**نوری**: باوەر بکە ئێستەش لیێ دەترسم.

احمد لەبەر ڕۆشنایی کۆڵانێك رادەوەستێو پارچە کاغزەکە دەخوێنێتەوە.

**احمد**: بەڵێ....

نوری، دەکاتە دەست احمد داو پسولەکەی لە دەست دەسێنێ.

**نوری**: (دەیخوێنێتەوە) «تکاتان لێ دەکەم بەڵکو بە فەیزی دەڵێن. ماوەیەکی کە مۆڵەتمان بدات».

**احمد**: ئەمە یەکەم جارمە نامەی دڵداری وەردەگرم....

(پێ دەکەنێ.. بە نوری) شەوباش. نوریو احمد لەیەك جیادەبنەوە.

ماڵی احمد. ژوورەکەی فاتمە. فاتمە لە زەویدا خەوتووە. ژوورەکە کلۆپێکی کز ڕۆشنای کردوتەوە. دەنگی کردنەوەی دەرگای حەوشە دەبیسترێ. فاتمە کوێ بۆ ترپەی پێ یەك هەڵدەخا. دەرگای ژوورەکە بە ئەسپایی دەترازێ. احمد سەری دەکێشێتە ژوورەوە. فاتمە نەخەوتووم کورم.

احمد دێتە ژوورەوە.

**احمد**: بۆ نانویدایە..

چەند جارێ تکام لێ کردووی، چاوەرێی من مەکە.

**فاتمە**: دەترسێم ڕۆڵە. دەزانم هیچ کارێکی خراپت نەکردووە، بەڵام هەر دەترسم.

**احمد**: (دایکی ماچ دەکات و بانی دەدات) بخەوە دایکە. مەترسێ هیچ نەبووە.

بەئەسپای دەردەچێتەوە دەرەوە.

ژووری بەرێوەبردنی«رووناکی». احمدو نوری. احمد پروڤەی ووتارێك تا کۆتایی دەخوێنێتەوە. قەڵەمێك بۆ نوری درێژ دەکات و بە خۆشی یەوە «دەست خۆش! ئیمزای بکە» نوری بە گرانێکەوە لەدەستی وەری دەگرێت. ئیمزای دەکات.

بەراکردن منالێك خۆی بەژوورا دەکات.

**احمد**: وەرە بزانم..

منالەکە دەردەچێتەوە دەرەوە.

احمد (بای باڵی خۆی دەدات): ئەمشەو لێرەدا دەمێنمەوە هەر کە چاپ کرا دەیبەم بۆ کارگەکە.

احمد هەندێ کاغەزو رۆژنامە لەجیاتی نوێن رادەخا

**احمد**: چاکەتەکەتم بدەرێ. بەڵام نەء.. جاری پێشوو چاکەتەکەی تۆم کردە سەرین. ئەمجارەیان نورەی چاکەتەکەی منە (چاکەتەکەی قەمچ دەکات و لە جیاتی سەرین لەژێر سەری خۆی دادەنێ) دە ئەمجارە فەرموو....

نوری پیلاوەکانی دادەکەنیّ و رادەکشیّ.

**نوری**: هەمدیس دەمانچەکەت لە گیرفاندایە. نوری دەمانچەکە لەگیرفانی چاکەتەکەی دەردێنیّ. احمد بیّ ئەوەی پیّ پەتی بکات رادەکشیّ، دەمانچەکە لەژیر سەری دا دادەنیّ. بە چاکەتەکەی نوری خۆیان دەپێچنەوە.

بەشی ووشك کردنەوەی کارگەکە. احمد «رووناکی» بۆ کرێکارەکان دەخوێنێتەوە.

**احمد**: (بەردەوامە لەسەر خوێندنەوە) «دز بەنهێنی دەستی بۆ گیرفانێك درێژ دەکات. هەرچی وەزیری ئابوورییە دەستی لەناو هەزاران گیرفاندایەو بە ئاشکراش. جیاوازی لە نێوان هەردووك ئا ئەوەیە.».

کرێکارەکانی دەوروبەری احمدو علی، بەراستی بەو ووتانە خۆشحاڵین، پێدەکەنن.

**دەنگی عزیز**: بەڵام، لە سەرەتاوە کەم کەسی گەرەکەکەی ئیمە «رووناکی»یان پیّ دەزانی.

یەکیّ لە کۆڵانەکانی گەڕەکەکە.

**منالێکی رۆژنامە فرۆش**: «دوا هەواڵ» دەنووسیّ...

«آقشام» «جمهوری‌یەت» «دەنگ و باسی سینەما»

خدیجە لە منالە رۆژنامە فرۆشەکە نزیك دەبێتەوە.

**خدیجە**: «رووناکی»یت پیّ‌یە رۆڵە؟.

**منالەکە**: پووریّ «رووناکی» چی؟.

**خدیجە**: رۆژنامەی «رووناکی»یت پیّ‌یە؟.

**منالەکە**: شتی وا نافرۆشم.

**خدیجە**: ئەگەر سبەی دەست نەکەی بە «رووناکی» فرۆشتن پیّ نەخەیتە ئەم گەرەکەوە.

**منالەکە**: پووریّ خدیجە، خۆ تۆ خوێندەواریت نییە..

**خدیجە**: فێربوومە.

**منالەکە**: «رووناکی» چۆن گۆڤارێکە. ئەدەبی‌یە؟

**خدیجە**: لەوانەیە...

**منالەکە**: لەوانەیە سیاسی بیّ.

**خدیجە**: لە وانەیە...

**منالەکە**: کیّ دەزانیّ رەنگە وەرزشی بیّ؟

**خدیجە**: هەموویانە... هەی شەیتان...

**دەنگی عزیز**: بەتەنها پووریّ خدیجە بەدوای «رووناکی»دا نەدەگەڕا..

ناوی پاسێك. محمود دانشتووە، خەریکی خوێندنەوەی «رووناکی»یە.

**محمود**: بەراستی چاك دەنووسیّ، بە تایبەت سەر نووسەرەکەی دەڵیّ هەرچی سامانمان هەیە پێشکێش بە بیانی‌یەکان کراوە. (بەوەی تەنیشتی) زۆر راستە، وانییە؟

**رێبوارەکە**: چۆن؟

**محمود**: رووناکی ناخوێنیتەوە؟

**رێبوارەکە**: نەخێر

**محمود**: بخوێنەوە بخوێنەوە، لاوەکان بخوێننەوە.

محمود گۆڤارەکە بەوەی تەنیشتی دەدا. ئەویش بەسەر سوڕمانەوە چاوی پیادەخشێنیّ.

زۆر نابا بە پەرۆشەوە دەست بە خوێندنەوەی دەکات.

محمود دەڕواتە ئەولاترەوەو لە تەك یەکێکی کە دەوەستیّ ژمارەیەکی کە لە گیرفانی دەردێنیّ و دەیداتە کابرای تەنشتی.

**محمود**: (بەوەی تەنشتی) زۆر راستە.. کار وابڕوا ووڵاتەکەمان تاڵان دەکرێت. رووناکی زۆر راستی کردووە.

**کابراکە**: (چاوی پیا دەخشێنیّ) بەراستی سەیرە، ئەمە لە کویّ دەیفرۆشن؟.

**محمود**: لە هەموو شوێنێك. ئەگەر دەتەویّ بیبە بۆ خۆت.

محمود ژمارەکەی خۆی بە کابرا دەدات. پاسەکە رادەوەستیّ. دادەبەزیّ. لە گیرفانی قەرەنفوڵێك دەردێنیّ و بۆنی دەکات.

دوکانەکەی فەیزی. کابرایەکی لاو راوەستاوە.

**فەیزی**: (چاکەتێکی بۆ درێژ دەکات) پیرۆز بێت. بە خۆشی

ئەم جۆراپانە لە پێ بکەیت. لە گۆڤارێکی چاکم پێچاوەتەوە.
وابزانم «آقشام» دەخوێنێتەوە.مامۆستای؟ شتێکی بێ تامە.

**دەنگی عزیز:** زۆری نەبرد «ڕووناکی» ناوبانگی دەرکرد.

قاعەی دادگایەکی چۆڵ. مدعی عام و یاریدەرەکانی دێنە ژوورەوە.

**مدعی عام:** سەرۆك. دەبارەی ڕووناکی زانیاری ویستووە. چۆن گۆڤارێکە؟ ئایا پەیوەندی بە «آقشام»ەوە هەیە؟.

**یارمەتی دەر:** بڕوا ناکەم... هێرشی دەباتە سەر «آقشام»

**مدعی عام:** پەیوەندی بە پۆلیسەوە بکەن. بزانن احمدو نوری خزمەتی کێ دەکەن.

**یاریدەر:** بەسەرچاو...

**دەنگی عەزیز:** ئەوەی ڕاستی بێ «ڕووناکی» یان باشتر بڵێین سەرنووسەرەکەی نوری پەیوەندی بە «آقشام»ەوە هەبوو.

ژووری سەرنووسەری «آقشام» ژووری ڕەفیق. کابرایەکی پڕوپری ریش و سمێڵ تاشراوە. ڕووناکی بەدەستەوە گرتووەو خەریکی خوێندنەوەیەتی گولسوم بە تەنیشتی‌یەوە دانشتووە.

**دەنگی عەزیز:** «آقشام»(*) بەفراوانی بڵاودەکرێتەوە ئەم «رفیق»ە. ئەو گاملەی بڕۆ ئەستورە دەوڵەمەندترین کەسی نێو ڕۆژنامە نووسەکانە.

**رفیق:** بەڵێ.. ڕاستەکەی نوری نووسەرێکی سەر سوڕێنەرە.

**گولسوم:** زووتر پیم ووتووی.

**رفیق:** هەرچەندە نووسینەکانی پڕن لە لاقرتێ، بەڵام دەزانێ چۆنی دەنووسێ.

**گولسوم:** پیاوی ئەستێرەیەکی کەیە. بەڵام بە تواناو خاوەن بەهرەیە

لەدەرگا دەدرێ.

**رفیق:** وەرە ژوورەوە.

کامیرا خێرا دەکشێتە دواوە، دیمەنێکی گشتی ژوورەکەی رفیق دەردەخا. «نەزیف»ی ڕۆژنامەنووس دێتە ژوورەوە. بالابەرزە جلێکی شڕی لەبەرایە. دەم وریشی دەتاشێ.

**نزیف:** داوای منت کردبوو.

**رفیق:** بەڵێ.. ڕیپۆرتاچەکەی دوێنێت یەك پول ناهێنێ سەرەڕای ئەوەش زۆر دەخۆیتەوە. خۆ سەرخۆش نیت؟.

**نزیف:** کەم..

**رفیق:** (لەپڕێکدا) «ڕووناکی» دەخوێنێتەوە؟

**نزیف:** نەخێر.

**رفیق:** نوریی سەرنووسەری ناناسی؟

**نزیف:** دەیناسم. هەندێ جار سەریان لێدەدەم.

**رفیق:** دەخواتەوە؟

**نزیف:** نەخێر.

**رفیق:** بۆ دەڕۆی بۆ ئەوێ؟ پۆلیس دەتنێرێ؟

**نزیف:** ئەمە چۆن گوتارێکە.

**رفیق:** جارێ بابمێنێ.. من تۆم بۆچی بانگ کرد.. بەڵام هەرچۆنێك بێ.. دەتوانی بڕۆی..

نزیف دەردەچێ.

**گولسوم:** بۆچی بانگت کرد باوە؟

**رفیق:** دەمەوێ لەگەڵ نوریدا بدوێ بەڵکو بۆ ڕۆژنامەکەمان دەنووسێ.. بەڵام وازم هێنا...

**گولسوم:** چاکت کرد.

**رفیق:** بەیەکجاری وازم نەهێنا.. بەدوای ڕێگایەکی‌کەدا دەگەڕێم.

ژووری بەڕێوەبردنی «ڕووناکی». احمد ووتارێکی لە بەردەستایەو پیا دەچێتەوە. چاکەتەکەی هەڵواسیوە.

شەوە. کلۆپێك ژوورەکەی ڕووناك کردۆتەوە.. نوری تەماشای ئەو نامانە دەکات کە بۆ «ڕووناکی» نێرراون. دڵی خۆشە. نامەکان بەدیقەتەوە دەخوێنێتەوە.

**نوری:** «مامۆستای بەرێز نوری بە پەرۆشەوە ووتارەکانت دەخوێنمەوە. بەڕاستی ئاڵای ڕاستیی و حەقیقەتت بەرز کردۆتەوە...»، (نامەیەکی کە هەڵدەگرێت و نامەکە دەخوێنێتەوە) «هاوڕێیانی خۆشەویست، ڕووناکی بەتایبەت

ووتارەکانت چاوی روون کردوینەتەوە. ووتەکانت دەربارەی سەربەخۆیی و ئازادی تواناو هێزی پێ بەخشیویت..».

**احمد:** (سەرهەڵدەبڕێ) کێ نووسیویە؟

**نوری:** (تەماشای ئیمزاکە دەکات) مامۆستایانی ناوەندی: سامیە، کەماڵ، زوهرە....

**احمد:** جوانە..

**نوری:** (نامەیەکی کە دەخوێنێتەوە) «هاوڕێیان، ئێمە ئێوە بەهاوڕێ و دۆستی خۆمانتان دادەنێین بەرێکەوت، «رووناکی» کەوتە دەستمان...)

(نامەکە دەداتە دەستی احمدەوە) ئەمە پەیوەندی بە تۆوە هەیە.. کرێکارانی نەوت نووسیویانە..

**احمد:** (بەبێ دەنگ نامەکە دەخوێنێتەوە) بتانرەژم..

**نوری:** (نامەیەکی کە دەکاتەوە): بەڵام ئەمەیان زیادەیە..

**احمد:** چی یە؟

**نوری:** وەی وەی.. وەی.. چەند گورچن.. نازانم چۆنت تێ بگەیەنم.

**احمد:** بیخوێنەرەوە بزانم..!

**نوری:** «مامۆستای خۆشەویستمان نوری، ئێوە وەکو خۆر رێگامان بۆ رووناك دەکەنەوە. ئێوە مانگن..»، (نامەکە دەنێتە ئەولاوە).

**احمد:** دەسەڵات چی یە.. ناوبانگ دەرکردن ئاوایە.. نوری نامەیەکی کە دەخوێنێتەوە.. رەنگی زەرد هەڵدەگەرێ، نێوچاوانی بەیەکا دەدات، جارێکی کە دەیخوێنێتەوە.

**احمد:** چی یە؟ چی بووە؟

نوری نامەکە دەداتە احمد.

**احمد:** (نامەکە دەخوێنێتەوە): «ئاڵچاغینە، وەتەن فرۆشان! بەدەست ئێمە گۆڕبەگۆڕ دەبن. سەگە سوورەکان» (نامەکە قەمچ دەکات) بێ گومان بێ ئیمزایە. فاشستە نامەردەکان..

**نوری:** ئەمانە هەموو شتێك دەکەن.. تاوانیش دەکەن.

**احمد:** هیچیان لەدەست نایەت.. وەستا علی دەبینم و تەکبیرێکی دەکەم.

**نوری:** پۆلیس ئاگادار دەکەمەوە.

**احمد:** نامەکە لەژمارەی داهاتودا بڵاو دەکەمەوە، با خەڵکی بزانێ. من دەڕۆم، باپەکت نەخەم.

احمد کاغزەکانی کۆدەکاتەوە. دەردەچی. نوری بەدوایا هەڵدەستێ.

دەرگاکە بە نیوەکراوەیی دەهێڵێتەوە، رێرەوە تاریکەکە دیارە. احمد لەچاو وون دەبێت.

نوری تەماشای تاریکایی یەکە دەکات. دواجار دەرگاکە کلیل دەدات. بەڵام زۆر نابا، هەڵدەستێ و دەرگاکە دەکاتەوە. دەرگا بە ئەسپایی دەترازێ و جیرەیەکی لێ پەیدا دەبێ. نوری دادەچەڵەکێ.

سەر هەڵدەبرێ.

**نوری:** کێ یە؟!

دەرگا لەسەرخۆ دەترازێ، نوری هەڵدەستێ..

**نوری:** (بەترسەوە) کێ یە؟

سینی یەك لەدەرگاکەوە دەردەکەوێ دواجار مناڵە چایچی یەکە دێتە ژوورەوە چایەك و سمیتێك بەسەر سینی یەکەوەیە.

**مناڵەکە:** منم، مامە نوری. مامە احمد هاتە چاخانەکە، ئەمەشی بۆ تۆ نارد.

**نوری:** بژی، داینێ.

مناڵەکە دەڕوات، بەدەم چا خواردنەوەوە ووتار دەنووسێت.. بەرە بەرە ترسی دەرەوێتەوە.

**نوری:** (ئەوەی نووسیوە بەدەنگێکی بەرز دەیخوێنێتەوە)

(ئەوەی چەپڵە بۆ تاوانەکانتان لێ نەدا
دەتانەوێ دەستی ببرنەوە.. دە ئێوەش
هەموو ئەم خەڵکە ببرنەوە... )

احمدو حلیمە بەسەر تەپەیەکەوە لەتەنیشت یەکەوە دانشتون. حلیمە کراسێکی مەنتۆی هاوینەی لە بەردایە. تووڵێکی رەشی بەسەرا داوە. پشیلەیەکی لە باوەشە.

**احمد:** ئەی هات و باوکت لە خدیجەی پرسی لەوێدایە یا لەوێ نییە؟

**حلیمه**: خدیجه راستی‌یەکەی دەداتە دەست.

**احمد**: ئەوجارەش گوناهی هەردووکمان بوو.

**حلیمه**: من هیچم نەگوتبوو. خۆی تێ‌گەیشتبوو.

**احمد**: چۆن.

**حلیمه**: نازانم. رەنگە تۆپێت ووتبێ.

**احمد**: ئەی ئەگەر هات و باوکت بەدواتا هات؟

**حلیمه**: (ئیشارەت بۆ لایەکی‌کەی گەرەکە دەکات).
دەتوانی پەنجەرەکەی خدیجە دەست نیشان بکەی؟

**احمد**: بابزانم.. هاها ئەو پەنجەرەیەیە. نەء ئەوی کە نەء.. نا یناسمەوە.

**حلیمه**: من پێتی نیشان دەدەم، بەلام... تەماشاکە، ئەو پەنجەرەیە کە تیشکەکەی کزە...

ئەگەر باوکم بێتەوە تیشکەکەی زۆرتر دەبێ منیش بەراکردن دەڕۆمەوە.

**احمد**: کێ ئەمەی فێرکردی؟

**حلیمه**: خۆم.. من باوکم ناخەڵەتێنم، کارێکی ناپەسەندە وانییە؟

**احمد**: مەیخەڵەتێنە..

**حلیمه**: ئەوکاتە یەکتر نابینین وەك ئێستا.

**احمد**: راستی‌یەکەی بەباوکت بڵێ.. یاخود من پێی دەڵێم. وابزانم واچاکترە..

**حلیمه**: (بەترسەوە) نەخێر نەخێر. لێم دەدات.

ژوورەکەی خدیجە رووتە، بەلام پاك و تەمیزو رێك و پێکە. گلۆپێك شۆرەشۆرێتی. بەکاغەزێك گلۆپەکە داپۆشراوە. خدیجە

چاوێلکەیەکی لەچاوکردووە، خەریکە جل پینە دەکات. لە دەرگا دەدرێت.

**خدیجه**: کێ‌یە؟

**دەنگی فەیزی**: منم. جلم هێناوە.

**خدیجه**: وەختی ترت نەبینی‌یەوە ئێستا نەبێ؟

دەرگاکە دەکاتەوە، فەیزی دێتە ژوورەوە.

**فەیزی**: ببورە سبەی ئەوەندە ئیشم هەیە.

خدیجە جلەکانی لێ وەردەگرێت.

**خدیجه**: دوگمەکانی کەوتوون. رۆژ بەرۆژ قەڵەو دەبێ.

فەیزی (تەماشای گلۆپەکە دەکات): ئەمەچی‌یە؟ زیانی هەیە بۆ چاوت (شتێك دەنێتە ژێر پێ تا دەستی بگاتە گلۆپەکە)

**خدیجه**: راوەستە چ دەکەی؟ با وابێ.

**فەیزی**: نەخێر نابێ....

**خدیجه**: پێت دەڵێم وازبێنە.

پێ‌ی دەخلسکێ‌و دەڕمێ. بەلام کاغەزی سەر گلۆپەکە لەگەڵ دەستیا دەهێنێتە خوارەوە. ژوورەکە بە جارێ رۆشنا دەبێتەوە.

ئەو شوێنەی کە حلیمەو احمد پێکەوە دانشتوون.

**حلیمه**: بەخوات دەسپێرم (بەتوند هەڵدەستێ)

**احمد**: چ بوو؟

**حلیمه**: تەماشا کە. تەماشای پەنجەرەکە بکە...
ئەمە بگرە (دەشڵەژێ. پشیلەکە دەداتە احمد)

باڵای تۆبێ بەدەم راکردنەوەو (جگەرو شیری بدەرێ).

حلیمه بە ڕاکردن دەڕوات. احمد لە دواوە تەماشای دەکات. دەست دێنێ بە پشت پشیلەکەدا. ماچی دەکات.

**احمد**: لای ئێمە دەبوژێتەوە.. خانمیش سەری سووك دەبێ.

نزیف لەبەردەم بەرێوەبەرایەتی «رووناکی»دا دەچێتە ژوورەوە لەدەرگا دەدرێ. نوری دەست لەکارکردن هەڵدەگرێ.

**نوری**: وەرە ژوورەوە.

نزیف درێژو لاوازە، دێتە ژوورەوە.

**نزیف**: مەرحەبا فەیلەسوف.

**نوری**: مەرحەبا دانیشە.

**نزیف**: سوپاست دەکەم. ووتم با سەرێکیان لێ‌بدەم و داوایەکت لێ دەکەم: فراقت[1] هەیە

**نوری**: (بەسەر سورمانێکەوە) فراق؟ نەخێر.

**نزیف**: ئەی سموکین[2]؟

**نوری**: نەخێر نیمە.

**نزیف**: مادام وایە دەبێ بەکرێ لەیەکێ وەربیگری.

(زەرفێك دەداتە دەست نوری) بۆ ئاهەنگی رۆژنامە نووسان بانگ کراوی.

نوری دەعــوات نامــەکــە دەخــوێنێتــەوە. لەو کاتــەدا نزیف خەریکی نامەکانی سەر مێزەکە دەبێت

**نوری**: بەڵام من ئەندام نیم لە نقابەی رۆژنامە نووسان. تا...

**نزیف**: دەبێت... جارێ ئەمــەیـان.. تابــەیــەك دەگــەینەوە لە ئاهەنگەکە (کە دەردەچێ) فراقت لێ دێ...

چێشتخــانــەکــەی محمــود. دەرەبــانــەکەی دادراوەتەوە. تەنها نوری و محمــودی لێیــە. لەونــاوەدا شلەژاوە. نوری لەبەردەم ئاوێنەیەکی کۆندا راوەستاوە بەرگی ئاهەنگی لەبەرە خۆی خاس دەکات.

**نوری**: دەزانێ کە بەکرێ هێناومە.؟

**محمود**: چوزانم. من بزانم ئەم کلکەی کەمێ درێژە.

**نوری**: ئەم جۆرە جلانە کلکی درێژ دەبێ باوە.

**محمــود**: مادام وایــە قەینــاکـا. نازانم خەڵکی بۆ خۆیـان بە قەلەرەش دەکەن(*)

(گوڵێك دەداتە دەست نوریەوە) ئەم گوڵەش بە یەخەتا بکە.

**نوری**: چۆنی دانێم نایزانم.

**محمود**: دەرۆم لە دوکتور عزیز دەپرسم.

**نوری**: پێویست ناکات (گوڵەکە دەنێتە گیرفانیەوە)

احمدو علی دێنە ژوورەوە.

**علی**: برۆ ناویانەوە، دەرکەوە. ئەمە چ تێدایە.

بە من بێ لە نەقابەی رۆژنامە نووسان ببی بە ئەندام

**احمد**: لە چاپخانە هەموو شتێك بەدڵی تۆیە. خۆت نارەحەت نەکەی. تو برۆ بەلای ئاهەنگەکەوە.

**نوری**: هەر خۆشبی.

خدیجە دێتە ژوورەوە.

**خدیجە**: تەماشا تەماشا چۆن لێ دێت. دڵی سەر تۆپ کچان ئەدزێ، ئەگــەر درۆیکــەم خوا کوێــرم کات. (بــە دەور نوریدا سوور دەخوات) تۆ تەماشاکە چۆن لاوانێك لەم گەرەکەی ئێمەدا پێ گەیشتون.

**نوری**: (بە احمد) ئەو تولەم نادەیتێ.

**احمد**: ئێ....

**علی**: بۆ چیتە؟

**نوری**: بەسەر خۆمیا دەدەم، نامەوێ لەم گەرەکەدا بەم جل و بەرگەوە بمبینن.

فەیزی کە دێتە ژوورەوە، گوێی لە ووتەکانی نوری دەبێت.

**فەیــزی**: دەبێ دوانــەکــەوین. تاکسی یــەکــە لەدەرەوە وەستــاوە. شوفێرەکەش ناسیارە.

لەبەردەم چێشتخانەکە تاکسی یەك وەستاوە. نوری سوار دەبێت. هەموویان لەدواوەوەی تەماشا دەکەن.

**خدیجە**: ئای خوایە..

هۆڵی نقــابــەی رۆژنــامــەنــووسان. دانشتوان بەچپە دەدوێن. چەنــد رۆژنــامــە نووسێکی بیــانی. خاوەن کارگــەکان. رۆژنامە نووسەکان. رفیق و گولــسوم

لەسەرمێزێك دانشتوون «ولی»یان لەگەڵدایە.

ولی کابرایەکی باڵاکورتێکی خرینی زگ زلە.

**رفیق**: (بەولی): ئەگەر پارتەکەی ئێمە دەسەڵاتی گرتە دەست وابزانم لە جێگاکەی خۆت دەمێنیتەوە.

**ولی**: ئومێدەوارم.

**گولــسوم**: باشە بابە، لەنێوان ئێوەو ئەواندا چ جیاوازی یەك هەیە. دوو رووی یەك پارەیە..

**رفیق**: یانی دەتەوێ بڵێی ولی، لەخزمەت ئەو پارەیەدایە؟.

**ولی**: زبانت تاڵە. چەندە زبانت تاڵە گولسوم.

(پێدەکەنێ)

**گولــسوم**: (هەڵدەسێ) دەمەوێ دانس بکەم.

ولی یش هەڵدەستێ.

**گولـــسوم**: گیــانــە تۆ پیــاوێکی چاکی. بەڵام دانسێکی خراپ ئەکەی.. لەلایەکی ترەوە، من گەلێ لە تۆ درێژترم رێك ناکەوین.

ولی دادەنیشێتەوە

گولسوم، لەگەڵ ئەوەی بەرامبەریدا چاك وچۆنی دەكات.

لەنزیف نزیك دەبێتەوە.

**گولسوم:** (بە نزیف) نەهات؟.

**نزیف:** لەمێژی...

**گولسوم:** كوا لە كوێدایە؟.

**نزیف:** ئەوەتانێ.

نوری لە سوچێكەوە بە تەنیا دانیشتووە.

**گولسوم:** پیاوێكی رێك و پێكە. جلەكەی كرێیە؟.

**نزیف:** بەڵێ..

**گولسوم:** بەیەكترمان بناسینە.

هەردووكیان بۆلای نوری دەچن.

**نزیف:** شەوباش. خۆبێزار نەبووی.

**نوری:** نەخێر.

**نزیف:** (بە گولسوم): ئەمە نوریەو نووسەری دروناكیەیە

گولسوم كچی رفیق بەگە.

نوری‌و گولسوم تەوقە لەگەڵ یەك دەكەن.

**گولسوم:** بێ‌خۆشی‌ڵێبووم بەناسینت.

**نوری:** منیش.

**گولسوم:** حەز لە دانس دەكەیت؟

**نوری:** حەزم لێیە بەڵام باش نایزانم.

**گولسوم:** هەرچۆنێك بێ قەیناكات.

نوری كەمەری گولسوم دەگرێت.

**نوری:** (بەنزیف) سبەی وەرەلام.

**نزیف:** باشە.

نوری‌و گولسوم دانس دەكەن.

**گولسوم:** دانس كردنەكەتم بەدڵ نییە.

**نوری:** پێم نە ووتی..

**گولسوم:** بەڵام قەیناكات.

**نوری:** ئارەزووی تۆیە.

ولی‌و رفیق تەماشای نوری‌و گولسوم دەكەن

ولی پێدەكەنێ.

**گولسوم:** چ كارێكت بەو ئالجاغە هەیە؟

**نوری:** دەمەوێ ببم بە ئەندام لە نقابەی رۆژنامەنووساندا.

**گولسوم:** هەر بۆ ئەمە؟ باوكم سبەی بۆتی جێ‌بەجێ دەكات.

**نوری:** سوپاستان دەكەم.

**گولسوم:** نووسینەكانتم بەدڵە.

**نوری:** دەخوێنیتەوە؟

**گولسوم:** بەلاتەوە رەنگە سەیربێ؟

**نوری:** ئێمە خەڵكی سەر ئەستێرەیەكی كەین

**گولسوم:** منیش لەبەر ئەوە ووتارەكانت دەخوێنمەوە.

بەتەنیشتِ گولسوم و نوریەوە، یەكێك گوڵێكی

سپی لەیەخەی خۆی داوە دانس دەكات.

نوری گوڵەكەی گیرفانی بیردەكەوێتەوە، بێ‌ئەوەی گولسوم پێی بزانێت لەگیرفانی دەریدێنێت.

دەیەوێ لەیەخەی خۆی بدات.

**گولسوم:** قەرەنفولێكی جوانە.

**نوری:** جوانە؟ (گوڵەكەی بۆ درێژ دەكات).

**گولسوم:** (بۆنی دەكات): بۆنێكی كەسكوێی هەیە بالای من بێت.

**نوری:** بێ‌گومان

گولسوم گوڵەكە دەنێتە لای دەمیەوە. چاوی لەچاو نوری دەبرێ. نوری بەدیقەتەوە تەماشای گولسوم دەكات. لەپشتیانە دوو دوو دانس دەكەن. هۆڵەكە رازاوەتەوە گلۆپی هەموو چەشنە داگیرساوە...

**نوری:** خۆ بێزار نەبووی؟

**گولسوم:** نەخێر...

گولسوم بەزەوقەوە، بەدەوری نوریدا سوور دەخوات.

لەگەڵیا دانتیللاو باڵونی رەنگامەو تووڵ پش سوور دەخوات بە دەوریا.

شەپۆلەكان تۆیەڵ تۆیەڵ كەفی سپی لە قەراغ

بەجێ دێلن ودەكشێنەوە. یەكێ لە بلاجەكان.

نوری‌و گولسوم لەپاڵ یەکتردا لەسەر قومەڵانی‌یەکە راکشاون، مایۆی رەنگاو رەنگیان لەبەردایە. لە گازینۆیەکی نزیکەوە دەنگی مۆسیقا دێت.

گولسوم: ئەو نامە بێ ئیمزایەی کە بۆ گۆڤارەکەتان نێررابوو خوێندمەوە.. شتێکی ترسێنەرە.

ناترسین.

نوری: نەخێر، . . .

گولسوم: پۆلیس لەمە ئاگادارە؟

نوری: لەمە باشتر ئەوەیە کە خەڵکەکە دەزانێ.

گولسوم: (خۆی بەسەر شانی نوری‌دا دەدا):

برۆیەکی جوان وپرت هەیە.

نوری: من کرێکارێکم..

گولسوم: بۆ وا غەمباری؟ بۆ وا تەماشام دەکەیت؟

نوری: پێت سەیرە کە تەماشات دەکەم؟

گولسوم: خۆشمت ناوێ؟

نوری: زۆر.

بەدەم قسەکردنەوەوە، لەقومە شێدارەکە خانوویەك دروست دەکەن. رفیق بۆلایان دێت. بە.

تەنشتیانەوە دادەنیشێ‌و ماڵە لە قوم دروست کراوەکەیان دەرووخێنێ.

رفیق: هەواڵێکی سەیر. لەم هەفتەیەدا پەیمانێکی یارمەتی ئابووری ئیمزا دەکات.

نوری: ئەمە یارمەتی نییە. رووت کردنەوەیە.

رفیق: دەزانم دەربارەی ئەمە هەڵوێستێکی رەقت دەبێ.

نوری وەرامی ناداتەوە هەڵدەستێ

گولسوم: بۆ کوێ دەرۆی؟

نوری: دەبێ ئەمرۆ ووتارێك بنووسم.

گولسوم: لەبیرت نەچێ دەبێ ئێوارە بۆنان خواردن لە «ئۆتێلی گراند» ئامادەبیت.

نوری دوودڵە. بەرامبەر گولسوم راوەستاوە. لەپشت گولسومەوە دیمەنی بلاجێکی جوان و دڵگیر دیارە.

نوری: باشە دێم.

ئەو تاکسی‌یەی کە لەمەو پێش بینیمان، هەمان تاکسی لە کۆڵانێکی تەسکەوە تێپەر دەبێ، احمدو نوری لە تەکسی‌یەکەدان.

احمد: پەیمانەکەیان مۆر کردو تەواو، هەموو شتێك کۆتایی هاتووە. بەڵام خەڵکی ناخەڵەتێن. ووتارەکەی تۆ. . .

نوری: لەناو ئەم بێدەنگی‌یەدا کە لە بێدەنگی گۆرستان دەچێت وەکو نارنجۆك دەتەقێتەوە.

احمد: بێ دەنگی گۆرستان؟ لەم ووڵاتەدا گۆرستانێك دەبینی گپ بێ؟ هەواڵەکە بەهەموو ولاتدا بلاوبۆتەوە.

نوری: رێکخراوی کارکەران، هەواڵەکەیان بلاوکردۆتەوە؟

احمد: بەڵێ.. لە ئێمە گورجترن.

لەکۆڵانێکدا چەند تاکسی‌یەك زەلامێك دێتە بەردەمیان. بەدەست ئیشارەتیان بۆ دەکات.

شۆفێرەکە هۆرن لێدەدات.

نوری: مەسەلە چی‌یە؟

شۆفێر: نازانم دەڵێی ئۆتۆمبیلەکە نابینێ کەوەك پوت راوەستاوە (تاکسی‌یەکە رادەگرێ) لەجامی تاکسی‌یەکەوە دیارە، پیاوێکی کە رووو تاکسی‌یەکە دێت. دەستیان لێدەکاتەوەو دەست رێژێکیان لێ دەکات. احمد خۆی.

دەدات بەسەر نوری‌یا. کابرا هەڵدێ‌و رادەکات.

دووکەس دیارە رادەکەن. احمد دەکەوێتە دوایان.

احمد: (بەشۆفێرەکە) تۆ فریای نوری بکەوە

شۆفێرەکە: (بەسەر نوری‌دا دادەنوێ) زامداری؟

نوری: نەخێر. وابزانم سەلامەتم. (دەست لە لەشی خۆی دەدات) هەست بە ئازار ناکەم.

بۆ کوێ رۆیشت؟

شوفێر: کەوتە دوایان.

نوری: بۆ دەستی لێ‌کردیتەوە. بانگی کەرەوە.، با زوو لەم ناوە

دوور بکەوینەوە. ئەمە شەڕە چەکە یاخود شەڕە بییرە. نازانرێت.
ئێمە قەلەم بەکاردێنین، ئەوان چەك بەکاردێنن.
احمد: (دەگەڕێتەوە لای تاکسی یەکە) خۆ هیچت لێ نەهاتووە؟
نوری: نەخێر.
احمد: لەچاو وون بوون. لەولا ئۆتۆمبیلێك چاوەڕێی دەکردن.
وابزانم ئەوەی ناو ئۆتۆمبیلەکە
نزیف بوو. بابڕۆین.
شۆفێر: (بەاحمد) بەڵام تۆ خوێناوی دیاری..
احمد: شتێ وا نییە.
دەکەونە رێ.
دەنگی عزیز: احمد یان بۆلای من هێنا زامەکەیم تیمار کرد.
احمد، راکشێنراوە. نوری لەخوار پێیەوە دانشتووە، شانی چەپی احمد پێچراوە. کراسەکەی.
بەخوێنەوەیە. نوری سەری خۆی ناوەتە نێوان.
هەردوو لەپێیەوە. دەرگا دەکرێتەوە. پێنج کەس دێنە ژوورەوە.
یەکەم: (تەماشای ئەو لایە دەکەن کە وای‌دادەنێن دوکتور عزیزی لێیە) تۆ دوکتور عزیزی.
دەنگی عزیز: بەڵێ..
یەکەم: ئێمە پۆلیسین (بەر بەلای احمدو نوری دەکات)
هاتووین بەشوێن ئێوەدا.
نوری: بۆ؟ چی‌بووە؟
یەکەم: فەرمانی گردنی ئێوەمان بەدەستەوەیە.
فەرمون (هەریەکەو فرمانی گرتنی بەدەستەوە دەدات).
احمد: (دەیخوێنێتەوە) «لەبەر ئەوەی دژی میری دەجوولێنەوە...»
نوری: کارێکی سەیرە من کەمێ پێش ئێستا،
دەست درێژیان کردە سەرم.
یەکەم: ئەمە مەسەلەیەکی کەیە. ئەوانە بە جەزای خۆیان دەگەن.
احمد: (چاکەتەکەی بەدەستەوە دەگرێت) مادام وایە بابڕۆین.

پۆلیسەکان نوری‌و احمد دەبەن
دەنگی عزیز: بەنهێنی درانە دادگا.
بەردەم هۆڵی دادگا. دەرگای هۆڵەکە گیراوەو دوو جەندرمە لە پێش دەرگادا بەچەکەوە وەستاوە.
لە پێش هۆڵەکەدا، خدیجە، فاتمە، حلیمە، فەیزی، علی، محمود دانشتوون. حەسەن بە بەردەم هۆڵەکەدا هات و چۆ دەکات، دێتە تەك حلیمەوە.
حەسەن: بڕۆین.
حلیمە: باوە.
حەسەن: پێت دەڵێم بابڕۆین (دەستی کچە رادەکێشێ).
خدیجە: ئاخ خوا فەوتت دا. ئەگەر ئێرە نەدەبوو.
شاخ سەرتم دەشکان.
فەیزی: حەسەن، بۆ وازمان لێ ناهێنی.
حەسەن: پێت دەڵێم با بڕۆین.
فاتمە: بڕۆ کچم بڕۆ..
هەموویان بەدەنگی نزم دەدوان. چەند کەسێکی‌کەش لەو ناوەدان. لەناو قەرەباڵغەکەدا ئەو کابرایەی احمد شوتی‌یەکەی بۆ هەڵبژارد دەبینرێ. ئەو دوو کەسەی کە محمود لەناو پاسەکەدا گۆڤارەکەی پێدان. چەند کەسێکی کە کە لەرۆژنامەکاندا کار دەکەن. ئەو مامۆستایەی کە جۆرابەکانی لە فەیزی کری. شۆفێری تاکسی‌یەکە.چەندکرێکارێك.
گولسوم. نزیف و خەڵکی کە. حلیمە هەڵدەستێ‌و لەگەڵ باوکی‌دا دەڕوات.
بەندیخانە.
دەنگی عزیز: ئەمەش بەندیخانەکەمانە. چاك شارەزای ئێرەم.
دووجار تیایا ماومەتەوە.. احمدو نوری لێرە توندکراون. هەر یەکەو دەساڵیان بۆ بڕینەوە.
جێگای بەڕێوەبردنی رۆژنامەی «آقشام». رفیق لە پشت مێزێکەوەیە. گولسوم دێتە ژوورەوە.
جلێکی تەسکی لەبەرایە، شەبقەیەکی لەسەر ناوە.

گولسوم: باوە . .

رفیق: بەخێر بێی . . خێرە؟

گولسوم: (دەڕوا بۆلای پەنجەرەکە) تەماشاکە بابە . .

رفیق: (لەجێگاکەی خۆی هەڵدەستێ): چی یە؟

(لەپەنجەرەکەوە تەماشای کۆلانەکە دەکات).

لەسەرەوە کۆلانەکە پیشان دەدرێت. فاتمەلە نزیك جێگای بەرێوەبردنی «رووناکی»یەوە راوەستاوە.

علی لە تەکایە. فاتمە بلاوکەرەوە بلاودەکاتەوە.

لەولاترەوە، محمود، شۆفێرەکەو ئەوانەی لە بەردەرگای دادگا راوە ستابوون لێرەدان.

فاتمە بەرگێکی تەنکی رەشی لەبەردایە، بەپارچەیە سپی لەچکی کردووە. دەفتەرێکی پێیە ئیمزا کۆ دەکاتەوە.

گولسوم: ئیمزا بۆ لێبووردن کۆدەکەنەوە. ئەوەی کە بلاوی دەکەنەوە تیایدا نووسراوە «من دایکی ئەوانم. ئەوانەی سەربەستی یانی دەوێت با ئەم دەفتەرە ئیمزا بکات». چی لێدەر دەچێت.

رفیق: چ دەلێی . . کارێکی زۆر دەگەیەنێ . . . هەلێکی چاکمان دەست کەوتووە. بەتایبەت بۆ هەلبژاردنەکە.

دەسەلات بەدەستەوە گرتن مسوگەر بوو کچم. (لە خۆشیدا دەست بەیەکدا دێنێ. دەرواتە پشت مێزەکەیەوەو دەست بە نووسین دەکاتەوە.)

کۆلانەکە. بەبێ دەنگی ئیمزا کۆ دەکەنەوە. هەندێ لاوو هەرزەگار دوای ئیمزا کردن دەستی فاتمە ماچ دەکەن و لەسەر سەری خۆیانیان دەنێن.

تادێ قەرەباڵغەکە زۆرتر دەبێت. ئەو منالەچایەچی یەی کە شەوەکە چای بۆ نوری هێنا لە فاتمە نزیك دەبێتەوە.

منالەکە: ئەبێ منیش ئیمزا بکەم؟ مامە احمد چەندە باش بوو.

فاتمە: وەرە ئیمزا بکە.

لەدەم کۆلانەکە پولیسی سوارە دەردەکەون. خەلکەکە بەزۆر داغان پێ دەکەن.

کۆلانە چۆڵ بووەکە.

فاتمە سکالانامەکەی بەدەستەوەیە. وەستا علی، محمودو منالەکە ماونەتەوە.

گولسوم لە پەنجەرەکەوە.

گولسوم: باوە پۆلیسی سوارە هاتن.

رفیق: پەیوەندیی بە ئێمەوە نییە.

بەندیخانە. ژوورێك لەبەندیخانە. نوری لەسەر قەرەوێلەیەکی دوو قات نووستووە. احمد لەبەر پەنجەرەکەدایە. پەنجەی لە شیشەکان گیرکردووەو بە ئاستەم گۆرانیدەلێ، لەسوچێکەوە کابرایەکی هەلاتوو بەراوە ستانەوە پشتی داوەتە دیوارەکەوە گوێی بۆ گۆرانی یەکە شل کردووە

نوری: (خەفەتبارە): بیبڕەوە . . ئەم کابرایەت بێزارکرد.

احمد: (کەمێ لەپەنجەرەکە دوور دەکەوێتەوە). واز لەم قسە پڕوپووچانە بێنە. لێرەدا پێش هەموو شتێك دەبێ پشومان هەبێ

نوری: باشە. تۆدان بەخۆتابگرە. (دەساڵ پشوبگرە.

احمد: ئەی چاوەڕێی چیت دەکرد؟وات دەزانی مەسەلە تەنها ناوبانگە دەرکردنە؟

نوری: ئەم حوکمە مردنمان دەگەیەنێ.

احمد: لە وانەیە . . . دواجار هەموومان دەبێ هەربمرین.

نوری: من دەمەوێ بژیم . . هەناسە هەڵمژم. کەهەناسە وەردەگری هەست دەکەی دەژی . . هەناسەم سوار بوو. کەمن مردم سەر زەوی دەبێ جەننەت نابێ بەجەننەت قیروقە وویسیا.

احمد بە سەرسوڕمانێکەوە تەماشای نوری دەکات.

ئەو رێگا خۆلاوی یەی کەبۆ بەندیخانەکە دێ، حلیمە بە پێ پەتی پیایا دێت، زەمبیلێکی بەدەستەوەیە ئوتۆمبیلێکی وەرزشی بەخێرایی بەرەو بەندیخانەکە دێت تۆزوخۆلی رێگاکە دەورووژێنێ. گولسوم لێی دەخورێ. لەبەردەم بەندیخانەکە رادەوەستێ، باوەشی کیسەو زەرف دەردێنێ. خەلکێکی زۆر لەبەر حەوشەی بەندیخانە چاوەڕێیانە، هەموویان تەماشای گولسوم دەکەن. لەولاوە دەرگایەکی بچووکی بۆ دەکەنەوە.

گولسوم دەچێتە حەوشەی بەندیخانەکەوە.

ژووری بەڕێوەبەری بەندیخانە. گولسوم دەچێتە ژوورەوە.

**گولسوم:** ڕۆژباش مدیر بەگ.

**بەڕێوەبەر:** بەخێر بێن. شتەکانی باوەش گولسوم وەردەگرێ و لەلاوە دایان دەنێت.

دالآنی بەندیخانەکە. گاردیانەکە دەرگای ژوورێك دەکاتەوە. احمـدو نوری دەر دەچن. لە پەیژەکان دێنە خوارەوە. نوری لەبەر دەرگای ژووری بەڕێوەبەر ڕادەوەستێ.

دەرگاکە دەکرێتەوە. دەچێتە ژوورەوە. احمد بە دالآنەکەدا شۆڕ دەبێتەوە..

جێگای چاو پێ کەوتن. ژێرزەمین ئاسایە. لەدیوی ناوەوەی تێل بەندەکەوە گاردیانێك بەخەڵکەدا دەڕوانێ.

بەندییەکان لەم دیوەوە، کەس و کارەکانیانیش لەو دیوەوە بەدەنگی بەرز لەگەڵ یەکتر دەدوێن. دیارییەکان لە کونێکەوە دەکرێنە ئەم دیوا، دوو گاردیان دەیپشکێنن، نان و نان و چورەکەکان هەڵدەپچڕێنن و تەماشای ناوەوەی دەکەن. تۆو لۆی جلەکان دەپشکێنن. زەمبیلەکەی حلیمە یاپراغی تێدایە بە زۆرە ملێ لەپەنجەرەکەوە دەیکاتەوە ئەم دیوا.

**گاردیانی یەکەم:** زۆر بەتامە.

**گاردیانی دووەم:** بیبەری زۆر کراوە.

**یەکەم:** (لەلاوە دایەنێ) دەدرێتە دەست احمدەوە.

احمد دێتە جێگای چاوپێکەوتنەکە. حلیمە فەرقی دەکات. بەدوای جێگایەك دا دەگەرین پێکەوە بدوێن. بە بێ دەنگی تەماشای یەکتر دەکەن. لەو دیو تێل بەنەکەوە

ڕووی حلیمە دیارە. لەم دیو تێل بەنەکەوە ڕووی احمد دیارە

ڕووی غەم میهرو خۆشەویستی تیادا دیارە.

بە تەنیشت حلیمەوە ڕووی ئافرەتێکی کەنەفتی هەژار دیارە.

**پیرەژنەکە:** (بە کورەکەی کە بە تەنیشت احمـدەوە وەستاوە) عثمان.. وای عثمان فەوتاوی وادیارە دەرچوونت نییە.

ژووری بەڕێوەبەری بەندیخانە.

**گولسوم:** (بە نوری) باوکم هەولێ بەخشین تان بۆدەدا (زەرفێك دەداتە بەڕێوەبەر) ئەمەم بۆ تۆ هێناوە.

**بەڕێوەبەر:** هەموو جاری وا مەججوبمان دەکەی (وەریدەگرێت)

گولسوم ئەوانەی دەستی دەداتە نوری.

ژوورێك لە بەندیخانە. احمد دەگەڕێتەوە ژوورەکەی. لەسەر نوێنەکەی دادەنیشێ، یەکە یەکە یاپراغەکان هەڵدەوە شێنێتەوە. لە چوارەم یاپراغ دا پارچە کاغەزێك دەردەچێ و دەیخوێنێتەوە. نوری، بەدیارییەکانی باوەشیەوە دەگەڕێتەوە.

**احمد:** ئای.. دووبارە دەوڵەمەند بووی. هەندێ جگەرەم بدەرێ.

**نوری:** نایدەم.

**احمـد:** بەڵام تۆ جگەرە ناکێشی. وامەکە هێز بە کار بێنم. (بەگاڵتەوە مشتی لێ بەرز دەکاتەوە).

**نوری:** بێبەلآبی بگرە (پاکەتێکی دەداتێ)

**احمـد:** لە جیاتی ئەمـە، با هەواڵێکی خۆشت بدەمێ دۆستەکانمان بە درێژای 20 ڕۆژ لە هەر چوار لای ولآتەوە ئیمزایان کۆ کردۆتەوە. بروسکەیان بۆ سەرەك کۆمار لێداوە. داواکردنی

بەرەڵلابوونمان بە جۆرێ پەرەی سەندووە دەست درێژی تێداکراوە.

**نوری:** دەزانم. باوکی گولسوم سەرپەرشتی لێ بوردنەکەمان بەڕێوەدەبات: ڕۆژنامەکەی گەیشتۆتە صەد هەزار. لەوانەیە پارتەکەی دەسەلآت بگرێتە دەست. بەم زوانە بەرەڵلا دەکرێین.

**احمـد:** (بەسەر سورمانەوە): لەوە بیردەکەیتەوە لە سایەی ئەوانەوە دەرچیت؟!

**نوری:** بەڵێ....

**احمد:** لە رقی ئەوانا دەبێ هەر بێ.

بەیانیانێکی خۆش. پێش حەوشەی بەندیخانەقەڵەباڵغە، کەیف خۆشن. لەناو قەڵەباڵغە علی، فاتمە، محمود، فەوزی،

حەلیمە، شۆفیرەکەو خدیجە دیارن. بەندییەکان لە دەرگای بەندیخانەکەوە دێنە دەرەوە. لەگەڵ ئەوانەی هاتوون بۆ پێشوازییان باوەش بەیەکدا دەکەن. ئافرەتەکان دەگرین. دایکی عثمان خۆی دەنووسێنێ بە قۆڵی بەندییەکەوە.

**دایکی عثمان:** کوا کورەکەم، عثمانم کوا.

**بەندییەکە:** بەخشینەکە بۆ هەموو کەس نەبوو، زۆر کەسی تری ماونەتەوە.

**دایکی عثمان:** کڵۆڵە خۆم. تەماشای ئەم لاو ئەو لای خۆیان دەکەن.

نوریو احمد دەردەچن، علیو محمود بانگیان دەکەن دەست هەڵدەتەکێنن. ئەوانی کەش لە دوایانەوە رادەکەن

**احمد:** ئەوانە خۆیانن. ئەوانەی لای خۆمانن.

احمد دەرواتە ئەولاوە. نوری لە جێگاکەی خۆی رادەوەستێ. گولسوم دێ بۆلای.

**گولسوم:** چاوودڵمان رۆشن، (دەستی نوری دەگرێت) هاتووم بتگەیەنم

احمد لەگەڵ علیو محمود باوەش لەیەك دەدەن. احمد بەراکردن بەرەو پیری دایکی دەچێ.

**محمود:** نوری لەکوێیە؟ (بانگی دەکات) نوری،

**گولسوم:** (بەنوری) باوکتە؟.

**نوری:** بەڵێ (نوری نازانێ چ بکات).

احمد بۆ لای دایکی دەروات.

**خدیجە:** (بانگی دەکات) نوری، هۆ نوری...

**گولسوم:** دایکتە؟.

**نوری:** دایکم نییە.

محمود لە نوریو گولسوم نزیك دەبێتەوە.

**محمود:** بۆ وا بەسەر سامی تەماشام دەکەی کورم؟ (باوەشی پیا دەکات).

نوریش باوەش بە باوکیا دەکات. بەسەرشانیەوە تەماشای گولسوم دەکات.

**نوری:** با باوکمت پێ بناسێنم گولسوم خان

**گولسوم:** پێ خۆشحال دەبم.

محمود لەبەر خۆیەوە بۆڵە بۆڵێك دەکات.

**نوری:** لەپێشدا گولسوم دەبەمەوە، دواجار دەگەڕێمەوە.

**محمود:** بەڵام.. ئێمە بیرمان لەمە کردبووەوە.

**نوری:** (دەستی گولسوم دەگرێت): داوای لێ بوردن دەکەم. (پشت لە باوکی دەکات) ئێستا دێمەوە باوە.

(علی دەبینێ) مەرحەبا وەستا علی.

**علی:** (لالووتە) مەرحەبا! دوانەکەوی..

نوریو گولسوم دەڕۆن.

علی دەچێتە بن باڵی محمودەوە.

**علی:** خۆت بگرە کابرا.. لێمان تێك مەدە، دەگەڕێتەوە.

احمد لەگەڵ خدیجەدا خۆش ودش دەکەن. لەگەڵ فەیزیو شۆفێرەکەدا باوەش بە یەکدا دەکەن. لە حلیمە نزیك دەبێتەوە. روو بەروو دەبنەوە.

**خدیجە:** (بەاحمد) چییە وەك داوڵ بەولووت کچەکەت گرتووە، باوەشی پیابکە.

گولسوم و نوری سواری ئوتۆمبیلەکە دەبن.

**گولسوم:** (دەبینێ احمد باوەش بە حلیمەدا دەکات): دەزگیرانی برادەرەکەتە؟

**نوری:** بەڵێ.. بابرۆین.

**گولسوم:** چاك دەکەی کە میوانداریمان پێ دەکەن. هاورێکانم چاوەرێمان دەکەن.

**احمد:** (تەماشای ئەملاو ئەولا دەکات) کوا نوری؟ (نوری لە ئوتۆمبیلەکەدا دەبینێ) نوری! ئوتۆمبیلەکەیان دەکەوێتەرێ.

**علی:** دێ.. خۆی دێ. بۆ راوەستاوین. دەی.

احمدو ئافرەتەکان بۆ تەکسییەکە. (بەمحمود) تۆش کابرای پیر، برۆ لەگەڵ ئەواندا سواربە بەتەنها علیو فەیزی دەمێنێنەوە.

**فەیزی:** کەشت رویدا تازە قسەکردن پارە ناکات.

# یانەی بەیان

**- بۆ خاوەنی (ئەم جیهانە بێشەیە):**

لەم دیوو ئەودیوی کاغەزەکە نوسیوتە

دێـرت نەپـەڕانـدوە، دەسـت خەتـت زۆر وردە ناخوێندرێتەوە. . . دوایی، ئەم نووسینەت زۆر ساکاربوو، شتێکی نوێی تیانـەبـوو ،خـۆت لەهـەندێ پێوەندی کۆن رزگار بکەو، ببورە.

**- بۆ خاوەنی (لێرەو لەوێ . .جێم مەهێڵە):**

تروسکـەیـەکی گەرمی شاعیـریت تیـا بەدی دەکـری، بەرهەمێکی ترمان بۆبنێرەو چاوەڕوانین.

**- بۆ خاوەنی (وڕینە):**

چیـرۆکـەکـەت لەرووی زمـان و تەکنیکیشـەوە باش نەبوون، هێشتاماوتەو پێویستە زۆر بخوێنیتەوە.

**- بۆخاوەنی چیرۆکی «ئۆخەی مرد»:**

ئەو بابەتەی لەسەرت نووسیوە، زۆری لەسەر نووسراوە، دوایی لەم دیـوو ئەودیـوی کاغـەزەکـەو بە خەتێکی ناخۆش نووسیـوتـە، لەهـەمـووش گرنـگـتـر پێـویـستیت بە خۆمـانـدووکـردنێکی زۆرهەیە. . کاك (سیاچارە). . تکایە ئەم قسـانـەمـان بە (شتنەوە) تێ نـەگـەی! بەڵکـو تەنها رێ پیشاندانێکی پێویستە

**- بۆخاوەنی (رۆژێك):**

بڕوات بێ حەزمـان دەکـرد، ئەم چیـرۆکـەت بۆ بڵاوبکەینەوە، چونکە وەکو سەرەتا بەهێزە ،بەڵام بە باشمان زانی چاوەڕوانی بەرهەمێکی چاکترت لێ بکەین، چاوەڕوانین.

**- بۆ کاك (سەرکۆ):**

دەڵێ ی:

بڕیـار وابـوو: گڕبـەربـدەم لەگشت ئاوات و ئامانجم لە دوارۆژەکەی گەشی خۆم

باشـە، کە دەزانـی دوارۆژت گەشـە، ئیتـر بۆچـی‌و لەپێناوی چیدا خۆت دەسووتێنی؟.

ئەی دوارۆژ ی گەش سەرلوتکەی هەموو هیواو ئاواتێکی ئادەمیزاد نیە. ؟

سەرەڕای هەمـووشتێـك، وێنـەی شیعـریی جوان لە بڕگـەکـانی تری شیعـرەکـەتـدا هەبـوون. . بەڵام ماویـانە پێ بگەن و بچنە ریزی شیعرەوە.

# ڕاپۆرتی ڕۆشنبیری بەیان

## ڕاپۆرتی هەولێر

ئامادەکردنی : سین



لەم مانگەو لە مانگی ڕابردوودا شاری هەولێری دێرین چەند جۆرە چالاکی‌ی ڕۆشنبیری‌و هونەری تیادا ساز کرا. . ئەم چالاکی‌یانەیش سەبارەت بە شارێکی وەکو هەولێر تازە بابەت نین، بە تایبەتی کە پارێزگاکە خۆی، مەڵبەندی ئۆتۆنۆمی ناوچەی کوردستانەو گەلێ دەزگاو لقی دەزگا ڕۆشنبیری‌یەکانی لێ‌یە. ئەمەش کارێکی سەرەکی‌ی کردۆتە سەرباری ڕۆشنبیری‌و جموجۆڵی بەردەوام، لە بواری کۆڕ سازکردن و پێشانگە ڕێکخستن و شتی‌تر. .

### ڕۆژی ڕۆشنبیری کوردی:

لە پێش ئەم چالاکی‌یانە ،ئاهەنگەکانی ڕۆژی ڕۆشنبیریی کوردی‌یە، کە ئەمساڵ بۆ یەکەمین جار یادی ئەو سەردانە مێژوویی‌یەی سەرەکی بەڕێز صدام حسین بۆ دەزگای ڕۆشنبیری‌و بڵاوکردنەوەی کوردی دەکرێ‌و وەکو ڕۆژێکی گرنگ و ڕووداوێکی هەرە بە کەڵك و پڕ سوود لە قەڵەم دەدرێ. . ئەوە بوو لێژنەیەکی باڵا لە لایەن وەزارەتی ڕۆشنبیری‌و ڕاگەیاندن بۆ ئەم مەبەستە پێك هات و گەلێ لایەنی ڕۆشنبیری‌و هونەری بوونە ئەندامی ئەو لێژنەیە ،وەك ئەمینداریتی گشتی‌ی ڕۆشنبیری‌و لاوانی ناوچەی ئۆتۆنۆمی کوردستان و یەکێتی‌ی ئەدیب و نووسەرانی کورد.

هەر لە سەعات (10)ی سبەینی‌ی ڕۆژی 1985/3/9 ەوەو ڕۆژانی دووا تر، کۆمەڵێ چالاکی ئەنجام دران. . لەوانە ئاهەنگی



کردنەوەی بیرەوەریی ئەو رۆژە کە لە ژێر چاودێری بەڕێز مامۆستا یحیی جاف سەرۆکی ئەنجومەنی راپەڕاندنی ناوچەی کوردستان کرایەوەو دەستەیەك لە لێپرسراوانی ناوچەو پارێزگا ئامادەی ئاهەنگەکە بوون. دووای وەستان دەقیقەیەك لە خزمەت گیانی پاکی شەهیدانی گەلی عیراق، بەڕێز سەرۆکی ئەنجومەنی راپەڕاندن ووتارێکی خوێندەوەو پیرۆزبایی لە رۆشنبیرانی کورد کرد. پاشان مامۆستا مصلح جەلالی بەڕێوەبەری گشتیی دەزگای رۆشنبیریو بڵاوکردنەوەی کوردی سەرۆکی لیژنەی باڵای باسمان کرد، ووتارێکی تێرو تەسەڵی خوێندەوە. .

بە درێژی باسی باری رۆشنبیریی کوردی کردو هاتە سەر بایەخدانی سەرکردایەتی شۆڕش بە پەرەپێدان و بووژاندنەوەی جوولانەوەی رۆشنبیریی عیراقی بە گشتیو رۆشنبیریی کوردی بە شێوەیەکی تایبەتی.

ئینجا نۆرە هاتە سەر شیعر. . برایان: پیربال محمود، مەغدید سۆران، عبداللە عباس، جلال ساکار ،عبدالخالق سەرسام، جلال حسن خۆشناو، ناظم دڵبەندو کاك محمود زامدار لە جیاتی جەنگاوەر رزگار اسماعیل، هەر یەکە قەسیدەیەك و دووانیان خوێندەوە. «لێرەدابە پێویستی نازانین دێرو کۆپلەیان لێ وەرگرین، چونکە لە کاتی خۆیدا لە هاوکاری بڵاوکراونەتەوە. س».

بۆ رۆژی دووەم و سێیەم، هەندێ چالاکی دیکە کران. .

لەوانە کردنەوەی پێشانگەی کتێبی کوردی، کە لە هۆڵی کتێبخانەی گشتیدا بە چاودێری بەڕێز ئەمینداری گشتیی رۆشنبیریو لاوان بوو. پێشانگەی وێنەی فۆتۆگرافی کە لە لایەن کۆمەڵی هونەرە جوانەکانی کورد ـ لقی هەولێر بۆ برای ئەندازیار «فارس سعدی» رێك خرابوو. پێشانگەی هونەری تەشکیلی کە لە یەکێ لە خانووەکانی قەڵاو شوێنەوارە مێژوویەکەی، لە لایەن بەڕێوەبەرایەتی رۆشنبیریی جەماوەر ئامادە کرابوو.

بۆ ئێوارەی دووا رۆژی ئەم بیرەوەرییە (رۆژی رۆشنبیریی کوردی) دەستەیەك لە مۆزیقا ژەن و گۆرانی بێژی رادیوو تەلەفزیۆن گەیشتنە هەولێر. ئەوە بوو خۆیان و تیپە خۆجێیەکانی هەولێر، لە هۆڵی رۆشنبیریی جەماوەر ئاهەنگێکی خنجیلانەیان پێشکەش بە هاونیشتمانیان کرد. .

هونەرمەندان: حسین علی، گوڵبەهار، عیسی بەرواری، خلیل وەندیو هی تر، بەشێکی ئەو ئێوارە ئاهەنگە بوون، کە هەر یەکەو گۆرانییەکیان گوت و خەڵکیان کەیف سازو دڵخۆش کرد.

ئەوەی جێگای سەرنجی ئێمەو کەسانی دیکەیش بێ، ئەمەیە کە ئاهەنگەکانی لەم دووایییەدا لە هەولێر رێك دەخرێن، هەر لە هەمان بازنەدا خول دەخۆنەوەو ئەو هونەرمەندانەی ناسراون هەمان گۆرانی دووپات دەکەنەوە، کە رۆژ نیە لە ئێزگەو تەلەفزیۆن و تۆمارگەکانی شارەوە، گوێ بیست نەبین. .

جێگای داخیشە تیپی میللی هەولێری سەر بە دامەزراوی گشتیی سینەماو شانۆ، لە چەند هەڵپەرکییەك بترازێ هیچی تری نەماوە. کەچی سوورن لە سەر ئەوەی بەشداری ئاهەنگەکان بکەن!

بە هەر حاڵ رۆژی رۆشنبیریی کوردی، ئەمساڵ لە هەولێردا ئەنجام دراو هیواداریں بۆ ساڵانی تر، خۆی بۆ ئامادەبکرێو یاد بکرێتەوە. .

## دیسانەکێ شیعر:

هەر بە بۆنەی ئاهەنگەکانی ئادارو نەورۆزەوە، یەکێتی‌ی ئەدیب و نووسەرانی کورد بە هەر سێ لقەکانی‌یەوە میهرەجانێکی بۆ شیعری کوردی سازدا.

سەر لە بەیانی‌ی رۆژی دووشەممە رێکەوتی 1985/3/18، هۆڵی یەکێتی‌ی ئەدیب و نووسەرانی کورد ـ لقی هەولێر، پڕی بوو لە شیعر دۆست و رۆشنبیرانی شار. برایان:

ساجد ئاوارە، پیربال محمود، عدنان ئەترۆشی، سامیە محمد، عبدالخالق سەرسام، شیعریان خوێندەوە..

تاقی ئێوارەیش هەر لە هەمان شوێن دا، خەڵکێکی یەجگار زۆر هاتنەوەو برایان:

رمضان عیسی، صلاح محمد، عبدالرحمن مزوری، محمدامین پێنجوێنی، عثمان شەیدا، خالد حسین یعقوب، شهاب عثمان، دلشاد مەریوانی، هەر یەکەو یەك دوو پارچە هەڵبەستیان کردە دیاری‌و کۆڵێ چەپڵە رێزانیان پاداشت وەرگرت.

ئەوەی شایانی باس بێ، بەر لە شیعر خوێندنەوە، ئامادەبووان ماوەی یەك دەقیقە بۆگیانی شەهیدانی نەمر هەڵسانە سەرپێ‌و مامۆستا د. نافع ئاکرەیی ووتەیەکی بە ناوی یەکێتی‌ی نووسەران خوێندەوە..

هەروەها بەرێز مامۆستا یحیی جاف سەرۆکی ئەنجومەنی راپەراندنی ناوچەی کوردستان و ئەمینداره بەرێزەکانی ناوچەو لێپرساوانی دیکەی پارێزگا ئامادەی هەر دوو کۆڕی سەرەوە بوون.

## شاعیرێك و دیوانەکەی:

هەر وەختە بگوترێ «پیربال محمود» بەشێکی مێژووی ئەم سەردەمەی خۆمانی شاری هەولێرە! چونکە هەر لەسەرەتاکانی پەنجاوە شیعر بەهەردوو زمانی کوردی‌و عەرەبی دەنووسی‌و بلاویان دەکاتەوە.. لەهەرەتی لاوێتی‌دا، دووسێ دیوانی بەچاپ گەیاندن.. پاشان وەزیفەو دراوپەیداکردن سەریان تێ‌کرد.. ماوەیەکی زۆریش هەروا بێ‌ئیشوکار شەقامەکانی هەولێری دەکوتانەوە.

ماوەیەکی دوورو درێژیش خەڵکی لەرێگەی شارەوانی‌یەوە پیربالی شاعیریان ناسی.. لەم کووچە بۆ ئەو کۆڵان و گەرەك، بەدوای قیرتاوکردنی شەقام و سزادانی ئەو خەڵکەی ئاوی پیس دەردەدەن یا خاوێنی‌و مەرجەکانی رەچاوناکەن.. لەگەڵ ئەمەیشدا پیاوێکی دڵ ساف‌ی بێ‌غایلەو غەرەزو تابڵێ‌ی حەز بەچاکە دەکا. خوا هەڵناگرێ گەڵێ یارمەتی دانیشتووانی دەدا‌و جاری وایش دەبوو عەرزو حاڵیان بۆبنووسێ‌و بەدوای کێشەو گیروگرفتیان بکەوێ.

مامۆستا پیربال ئەمرۆ کە خانەنشینە.. ناوە ناوە بە چاوڕاوو هاندانی برادەران و دۆستە لەمێژینەکانی، دێتە سەرشانۆو شیعر دەخوێنێتەوە. لەم دواویی‌یەدا بەهۆی ئەمینداریتی گشتی‌ی رۆشنبیری‌و لاوان دیوانێکی لەچاپدرا..

(بزەی سروشت) بە بەرگێکی سە وزو سوور خۆی کوتایە نێو کتێبخانەی کوردی. دیوانەکە بریتی‌یە لە (194) لاپەرەی قەوارەگەورەو قەسیدەکانی هەموویان لەسەرکێش و قافیەن و مێژوو و بەرواری کۆنیان بەسەرەوەیە.. وەك هەڵبەستی (چی‌بڵێم؟) کە ساڵی 1955 لەپیرمام دا (هاوینە هەواری سەلاحەددین) دایناوەو تیایدا دەڵێ:

چی بڵێم ئەگەر گوێندەی دەنگە خۆش
هاتە خەونگەی زایەڵەو خرۆش
زانی دووزەڵەی ئاوازی بەجۆش
نقووم بوویتە نێو خەفەتی رەش پۆش
نە دڵ تێر ئەکا نەموچرك و هۆش
نە دێتە خرپە لەگەڵ هوزاران
نەفێنك ئەکا کامی هەژاران
بڵێم ئەندیشەم وەك گوڵی شەوبۆ
ووشك بوو یاخود مامەوە بێ بۆ؟

# ڕاپۆرتی سلێمانی

ئازاد محمود



بەو نیازەی تیشکێ بخەینە سەر هەواڵە ڕۆشنبیری وئەدەبیەکانی شاری سلێمانی، تا بەڕوناکی لەسەر لاپەڕەکانی گۆڤاری «بەیان»ی ئازیز دیارو پرشنگدار بمێنێتەوە..

لەم ژمارەیەوە ئەو هەواڵە ڕۆشنبیریو ئەدەبیانە پێش کەش ئەکەین و باسیان لێوەئەکەین، کەلە مەڵبەندی شاری سلێمانیدا کراون و خۆمان ئامادەی بووین، لە ژمارەکانی داهاتوودا پەنجە بۆ ئەو چالاکیانەش درێژ ئەکەین کە لە قەزاو ناحیەکانی سەربە پارێزگای سلێمانی پێ ی هەڵئەستن بەمەرجێك یەکەم ئەگەر خۆمان ئامادەیی کاتی پێش کەش کردنیان بووین، یان بەهۆی دەزگاکانی ڕۆشنبیریو ڕاگەیاندنەوە پێمان بگات، یان بەهۆی ئەو برادەرانەی کە خۆیان دەوریان هەیە لەپێش کەش کردنی چالاکیەکاندا، هەروەکو زوربەی ئەو هەواڵانە بەهۆی ئەوانەوە بۆمان دێت، بەڵام ئەمەی لێرەدا ئەمانەوێت باسی لێوە بکەین تایبەت ئەبێت بەگۆڤاری «بەیان».

لەهەواڵەکانی مانگی ئاداری 1985 لە بیرەوەری ڕۆژی ڕۆشنبیری کوردیدا، ڕۆژی 1985/3/9 بەڕێوەبەرایەتی ڕۆشنبیری جەماوەر پێشنگایەکی تەشکیلی بۆ هونەرمەند لاو کامەران صدیق کردەوە، تیایدا هونەرمەند «30» تابلۆی هەمەرەنگی خۆی پیشان دا، هونەرمەند هەندێ بیری لە چوارچێوەی ئاڵۆزی چەند تابلۆیەکدا جێ کردبووەوە، کە بینەران هەروا بەئاسانی لەبۆچونەکانی هونەرمەند نزیك نەئەبونەوە، بەمەش هونەرمەند لەبۆتەی ئەو هونەرە تەقلیدیەدا ئەمێنێتەوە.

هەر لە بیرەوەری ڕۆژی ڕۆشنبیری کوردیدا، دەزگای ڕۆشنبیریو بڵاوکردنەوەی کوردی ڕۆژی 1985/3/10 کات ژمێر 3ی پاش نیوەڕۆ. کۆڕێکی شیعر خوێندنەوەی بۆ شاعیرە لاوەکانی ڕانیەو قەڵادزێو سەنگەسەر سازکرد، لەهۆڵی مەڵبەندی لاوانی ڕانیە، تیایدا جەماوەرێکی زۆری ئەدەب دۆستان، ئامادەی بوون.

لەم کۆڕەدا میوانداری شاعیری بەڕێز غەریب پشدەری کرا لەسەر خواستی ئامادەبوان چەند پارچە شیعرێکی ناسکی پێش کەش کرد، کەبەجارێ هۆڵەکەی هێنایە جموجوڵ و خۆشی، مامۆستا پشدەری



ڕێزێکی تایبەتی هەیە لای ڕۆشنبیرانی ئەو ناوچەیە، هەر بۆیە زوربەی شاعیرەکان شیعرەکانیان پێش کەش کردبوو، هیوامانە هەموو ڕۆشنبیرێ لەشوێنی خوێندا ئاوا جێگای خۆی بکاتەوە، کۆڕەکە شاعیری لاو ئیبراهیم هەورامانی ئەیبردبەڕێوە، تیایدا وتەی دەزگای ڕۆشنبیری خوێندرایەوە، برای نوسەر کاك عمر مەرگەیی وتارێکی خوێندەوە تیایدا ووتی:

لەکاتێکدا ئەدەب، لەبەرگی کۆنینەی لاسایی و ستاتیکێت دێتەدەری و لەگەڵ ڕەوتی مرۆڤایەتی و شارستانیێتدا، بەرگی تازەی سەردەمی زانست و مەنتق و ریالیزم لەبەرئەکا، دەبێتە هەڵگری مەشخەڵی سەرفرازی مرۆڤ و هەنگاوی دنیای جوڵەو هەژان و وشیاری کۆمەڵایەتی و، فەرهەنگی ڕۆشنبیری کۆمەڵ بنیات ئەنێ، تالەو کاتەدا کێ هەیە شۆڕە سوارەکانی ئەم کاروانە بەمامۆستاو رابەرو پێشرەوی خۆی نەزانێ، کام شاری سەر بڵندی ئەوین و سەرفرازی هەیە، ئامێزی نیانی خۆی بۆیان والا نەکاتەوە، خۆی تێکەڵ بەهەست و خوێنیان نەکات.

پاشان شاعیرە لاوەکان، یەکەیەکە شیعرەکانی خۆیان ئەخوێندەوە سەرەتا شاعیری لاو.

**حەمە جاف لەشیعری «تۆ شۆڕە سواری دمدمی»دا ئەڵێ:**

**گەر ڤینوسی خوای جوانی بای**
**وەکو کۆیلە**
**بۆ جوانیت دەچەمامەوە**
**گەر نێرگزی پێدەشتان بای**
**وەکو هەنگێ**
**بۆ بۆنت دەنوشتامەوە...**

★ ★ ★

**نیازی حمە عزیز لەسرودی خوێن دا ئەڵێ:**

**هەموو ڕۆژێ لەگەڵ گزنگی بەیاندا**
**دەنگی «فیرۆز» وەك و گوڵمێخ**
**بەناخی دڵی لاوانی ئەم شارەدا**
**دەچێتە خوار...**
**هەموو ڕۆژێ.. سەرنجی ئاوارەی (دەروێش)**
**شنەی دێنی بەسەر مەزرای**
**زەرد هەڵگەڕاوی (یافا)دا**

•

**شاعیری لاو قادر ژەوان لە یادگارە شیرینەکانی ڕۆژگاری ژیانی خۆیەوە دەڵێ:**

**ئەو ڕۆژە**
**کەئێستا تاڵێ بۆ دەچێژم**
**پتر پرتر**
**لێو بەبزەو بەقاقایە**
**تادەڵێ:**
**هەتا دەتوانم**
**لەناخی دڵم دا**
**بناغەی بەتوندی بۆ دادەڕێژم.**

★ ★ ★

**من دەمەوێ تۆ بزانی.. ناونیشانی هۆنراوەیەکی شاعیر عوسمان محمود ئەحمەد بوو تیایدا ئەڵێ: ـ**

**من دەمەوێ**
**کانی هەتا هەتایی ژینێ بم**
**برژێمە نێو گەرووتەوە**
**تاسەو تینوەتیت بشکێنم**
**گیانی نەمریت بەبەرداکەم**
**لەبەر دەمتا مەرگ بەچۆکاندا بێنم**
**من دەمەوێ..**

**تەنیا ئاکۆ. چەند پارچە شیعرێکی میللی پێش کەش کرد:**

**لەگەڵ گرمەی هەوری بەهار**
**هەموو مێرگ و کانیو رووبار**
**گشت دەتەقن و دەژێنەوە**
**گوڵ لەباخان دەشنێنەوە**
**لەسەرچڵ خۆ رادە ژێنن**
**بولبولیزار دەگرینن**

★ ★ ★

**شاعیر سلام عمر کریم لە کۆچێکی تاڵ دا.. روی دەمی ئەکاتە ئازیزەکەی پێیئەڵێت:**

دەئازیزم کەجێم دێڵی
نەکەی بەگاسنی پەنجەت
زەوی عیشق و شادمانیم بۆ بکێڵی
کەجێم دێڵی
نەکەی بێڵی
عەشقت بەکاڵ لەلایمن
یا بەوێڵی.. جێبهێڵی..

**حسن محمد عبداللەی شاعیریش دەڵێ:**
چۆن هەست ناکەم نازدارەکەم
ئەی ئەوەنیە
دڵت، دڵمی
لەناو خۆیدا بەندکردوە
کەس ناتوانێ دەری بێنێ
جگە لەپاسەوانی لێوت
کەس نایدوێنێو کەس نادوێنێ

★ ★ ★

لەکۆری شیعری لاوانی رانیەدا وەکو ووتمان عەریب پشدەری شاعیر بەشداری کرد، هەروەها کاك ئیبراهیم هەورامانیش بەشداری کردین بە شیعرێك....

ئێوارەی 1985/3/11 لە هۆڵی نەقابەکانی کرێکاران لەسلێمانی.. کۆرێك لەلایەن دەزگای رۆشنبیریو بلاوکردنەوەی کوردی بۆ لەتیف قەرەداغی سازکرا.. لەژێر ناوی هونراوەی ئافەرتی کورد لەهەڵسەنگاندێکی گشتیدا لە هەڵوێستی ئافرەتی کوردا.. کەتیایدا کاك لەتیف رەخنەی لەکتێبەکەی د. کوردستان موکریانی هونراوەی ئافرەتی کورد ـ گرتبوو، هەرچەندە نوسینەکەی کاك لەتیف لەگەڵ کاتی دەرچوونی کتێبەکە زۆری بەسەردا رۆیشتبوو، بەلام دەزگای رۆشنبیری لای کردەوە، بەوەی کە بەرهەمە ئەدەبیەکان نابێ بمرن و لەگۆشەی زەقی تاقەکاندا بمێنێتەوە.

کاك لەتیف نوسینەکەی ناونابوو هەڵسەنگاندێکی گشتی لەهەڵوێستی ئافرەتی کوردا.. کەئەمە بەگشتی لەناو نوسینەکەیدا، دیار نەبوو تەنها رەخنەی کاك لەتیف لەروی تەکنیکی هونراوەکانی ناو کتێبەکە گرتبوو، کەئەبوایە دکتورە کوردستان زۆرتر بگەرایە بەدوای بەرهەمی ئافرەتی کوردا.. ئەوەبو سەرئەنجام مشت ومرێکی زۆر لەسەر ئەم کۆرە کرا لەلایەن..

رۆشنبیران و ئەدەب دۆستانەوە، کە ئامادەی کۆرەکەبوون، کۆرەکە نزیکەی دوو کات ژمێری خایاند..

● تیپی پێشرەوی شانۆی کوردی.. لەبەرهەمێکی نوێدا، کەلە ئەدەبی چینیەوە ـ کمال صابر وەری گێراوە بۆ کوردیو ئازاد محمد بچکۆل دەری هێنابوو بۆسەر شانۆ، مامۆستا خالد سەرکار ئاوازی بۆ دانابوو.. لەرۆژی 1985/3/16. لەسەر شانۆی ئامادەیی صلاح الدین کوران پێش کەش کرا.. ئەو شانۆگەریە.. وەك لەبینینیدا هەست ئەکەیت شانۆی گۆرانیە... بەلام بەم ناوەوە باس نەکراوە...

تیپیپێشرەوی شانۆی کوردی، گەلێك بەرهەمی نایابیان پێش کەش بەشانۆی کوردیمان کردوە... ئەم بەرهەمەشیان شاکارێکە ئەچێتە پاڵ ئەوان.. بەلام جیاوازیەك بەدی ئەکرێت.. لەنێوان بەرهەمی

ئەمساڵ و رابوردی ئەم نیەدا.. هەرلە ئەکتەرەکانەوە، تا هەڵبژاردنی بەرهەمەکە... «گەران بەدوای دەستگیران دا» ناونیشانی بەرهەمە نوێکەی تیپی پێشرەوە، کە لە ئەڵقەیەکی بێ‌هودەیدا ئەسورێنەوە بەدوای دابین کردنی دەستگیرانی مەسەلەکە، لەو گاڵتە جارییەی کە بوو بوو بە نوکتە بۆ خەڵکی ناوچەکە.. پاشان ئاوازی شانوگەرییەکە، لەگەڵ ئەو هەڵسووکەوتەدا نە ئەگونجا ئەو جۆرە ئاوازانە بۆ ئۆپەرێتی ئامادە کرێت باشترە..

● لە 3/19 تا 1985/3/24 رۆشنبیری جەماوەر لەسلێمانی پێشانگای تایبەتی هونەرمەندی کۆچ کردو ئەندازیار محمود عبدالرحمن کردەوە، تیایدا (30)سی تابلۆی هونەرمەندی جوانەمەرگ پیشان درا.. تابلۆکانی ئەم هونەرمەندە وەك زنجیرەیەك زوربەیان پەیوەندی بیریان بەیەکەوە بوو، کەتیایدا هونەرمەند قەڵەمی رەساسی، «جاف و مەرەکەبی - بەکارهێنابوو...

● کۆرێکی شیعر خوێندنەوە بەبۆنەی جەژنی نەورۆزەوە لەلایەن یەکێتی ئەدیبان و نوسەرانی کورد لقی سلێمانی ئێوارەی 1985/3/23 لەهۆڵی نەقابەکانی کرێکارانی سلێمانی.. بەئامادەبوونی کۆمەڵێکی زۆر لەئەدەب دۆستان و رۆشنبیرانی شارەکە.. برای نوسەر کاك ئازاد عبدالواحد کۆرەکەی بەرێوە ئەبرد....

ئەم کۆرە کە بۆ شیعر خوێندنەوە ئامادەکرابوو، بەبۆنەی جەژنی نەتەوایەتیمان جەژنی نەورۆزی پیرۆزەوە بەنۆبەری یەکێتی ئەژمێرێت پاش هەڵبژاردنی دەستەی بەرێوەبەری نوێ.. سەرەتا مامۆستا محمد امین پێنجوینی سەرۆکی یەکێتی ئەدیبان و نوسەرانی کورد لقی سلیمانی ووتاری نوسەرانی خوێندەوە.. تیایدا هەڵسانەوەی یەکێتی و دامەزراندنی لقی سلێمانی روون کردەوە، کەلەسەر دەستی کۆمەڵی نوسەر پێك هاتووە، نەیان ویستەوە، یەکێتی نوسەران هەروەها بەبێ دەنگی بمێنێتەوەو چۆك دادا...

ئێستا یەکێتی پاڵپشتی ئەو نوسەرانەن کە خامەکەیان لەپێناوی وشەی ئازادیخوازو رەسەنی کوردیدا بنووسێ، هەروەها ئەوەی روون کردەوە، کەیادی دووسەد ساڵەی سلێمانی یەکێکە لەو بەرنامانەی‌ کە یەکێتیمان بریاری لەسەر داوە، لەمیهرەجانێکی قەشەنگا ئەو یادە ئەکەینەوە.

باسی ئەوەی کرد کە لقی یەکێتی شان بەشانی لقەکانی‌ترو مەڵبەندی گشتی گۆڤاری تایبەتی خۆی دەرئەکا.. ناوی «پیرەمەگرون»ی بۆ هەڵبژێراوە.. شایانی باسە کە شاعیرانی دهوك و هەولێرو کۆیە بەشداری کۆری نەورۆزی یەکێتی ئەدیباتەو نوسەرانی سلێمانیان کرد، بەشیعر خوێندنەوە...

ئەم شاعیرانە بەشداریان کرد س. ع. شادمان، هزرڤان، حمە علی وریا، محمد امین پنجوینی، فوزی محمد، شیرکۆ عبدالله، ساجد ئاوارە، سامیە محمد، ئیبراهیم محمد ئیبراهیم لەتیف قەرەداخی، محمد عمر عثمان، شەهاب عثمان،دلاوەر قەرەداخی، هوشیار محمد حسن، ئاوات کامل توفیق نەبەز. لەکۆتایی ئەم کۆرەدا لەلایەن سەرەکی لقی سلێمانیەوە چەپکێ نێرگز پێش کەش بەشاعیری ئازادیخواز مامۆستا محمد صالح دیلان کرا، لەرێزلێنانی ئامادەبوونی بەرێزی.. ئەمەش چەند کۆپلەیەك لەو شیعرانەی پێش کەش کران: -

**لەتیف قەرەداخی - نەورۆزو کاوە..**

یادە، یادی ئاسنگەری
چەکوش وەشێن کورد پەروەری
هەڵی گیرساند، ئاگری قین
بۆ گڕ، بەردانە خوێن مژین
لەرێی سەرکەوتنی بروا..
بەسەر ئەوەی مێشك دەخوا..

★ ★ ★

# رایۆرتی بەغدا

- دیدەنی -

لە دانا رەئووفەوە





ساجد ئاوارە.. لەبەهار - دا ئەڵێ: -

نێرگزە جاڕی شارەزوور
بۆنی ئێوە واهات لەدوور
چاوی گەشتان دەیسەلمێنێ
ئەم خاکەمان هەر دەمێنێ..

★ ★ ★

دلاوەر قەرەداخی لە «میحراب»دا وتی: -

ئێوارەیەکی خەمگینەو
تۆی بەندەریش
لەگەڵ ئاوابوونی خۆر
کۆمەڵێك خەمی زۆر گەورە
لەدڵ ئەنێ‌ی
ئێوارەیەکی خەمگینەو
تۆی بەندەریش
لەگەڵ ئاوا بوونی ئەوا
دڵە ناسکەکەت پڕ ئەبێ‌و
نەرم... نەرم
گۆرانی تەنیاییت ئەڵێ‌ی

★ ★ ★

ئیبراهیم محەمەد ئیبراهیم لەکۆیەوە: -

ئەزانم کەگوڵ و گەڵاو سەوزەگیا
بۆ گەنج بوونەوە لەپایزدا خۆیان دەکوژن
ئەزانم: کەلە ئازاری لەشی زستان
ئاهەنگی لە دایك بوونی بەهار سازدەکرێ
ئەزانم: کەسەوزەگیا لەسەر زەوی خۆی رادەخا

★ ★ ★

هەموو بەیەکاچوون و کێشەو ئالۆزیەکی سەردەم، گێژاوێکی گەورەی لەبن نەهـاتـووی گشت رێبـازە فکـریـە پێش کەوتووەکانەو شڵەقاندنی گۆمی هونەرە.. هەروەها هەنگاوێکی خێرای تازەگەری و ئەفراندنی بوارەکانێتی.

ـ هەردوو جەنگی گەورەی جیهان.. نامۆیی.. رارایی.. هەموو نەخۆشیـە دەروونیـەکـان کـە بەشێـوەیـەکی گشتی تووشی کۆمەڵگای مرۆڤـایـەتی هاتـووە، بەتـایبـەتی لە ئەوروپادا.. نەمانی سەربەستی رۆحی.. سەپاندنی دیاردە مادیەکان و لەدەست چوونی بوون ـ ئەمانە هەمووی رێگا خۆشکەرێکی تەقینەوەی بوورکانی هەموو دیاردە فکری و هونەرییە نوێ و پێشرەوەکانی ئەم سەدە ئالۆزەیە؟!

شانـۆی پێشـرەویش یەکێکـە لەو تاقی کـردنـەوە مەزنانەی کە توانی بوارێکی فراوان لەشانۆی جیهان داگیر بکات، و رووبەرووی گرفتە ئەزەلیـەکـان ببێتـەوە.. پەردەش لەرووی هەمـوو پەیـوەنـدی و بەهـا مزەیەفەکان هەڵماڵێت.. یەکێت گەورەترین نوێنەری ئەو رێبازەیە کە یونسکۆو ئەدامۆڤ و جان جینیە شوێن پێیان هەڵگرتو، توانیان لە نیوەی دووەمی ئەم سـەدەیەدا بوونی خۆیان و رێبازەکەیان بـسەپێنن. بێگومان جێ پەنجەو کارتێکردنیان بەسەر زۆربەی نووسەرانی جیهانەوە دیارە.

شتێکی ئاســایشــە کە ئەم رێبـازە جێگـای خۆی لە وڵاتێکی وەك یۆنان دا بکاتەوە، کە خاوەن رابردوویەکی مەزن و دەوڵەمەندی گەورەی هونەری شانۆو دراماییە. لەم وڵاتەدا ئەمرۆ چەند نووسـەرێکی شانۆیی هاتوونەتە گۆڕەپانی دراماوە و هاوشانی شانۆی (اللامعقول) هەنگاوی خێرا ئەنێت.

لەوانــە کیــژە نووســەری بلیمـەت (لـۆلائـەنـاغنـوستـاکی)یـە کە شانۆییەکانی. رووبەکە لە رووە قوڵ و فراوانەکانی مرۆڤ و بوونی مرۆڤ.

ئەمـرۆ ئێمـە بەختیـارین کە تاقی کـردنـەوەیەکی دوڵەمەند بەشانۆی کوردی شاد ئەبێت بە دەقێکی ئەم کیژە.

لەرۆژی 1985/3/28دا کۆمـەڵـەی رۆشنبیـری کورد لە بەغـدا شانـۆیی دیـدەنی پێش کەش کرد لە دەرهێنـانی ابـراهیم چێـوارو وەرگێـرانی رؤوف بێگـەرد، بێگـومـان ئەم شانـۆییـەش لەگـەڵ دوو تێکستی تر شانۆگەریەك پێك دێنن.

دیـدەنی زنجیـرەی دووەم و ـ شار، ڤیستیڤـاڵ ـ زنجیـرەی یەکـەم و سێ هەمە. دیدەنی لە توندو تیژی و ئازادانی مرۆڤ بەرامبەر بەمرۆڤ و چۆنیەتی چێژوەرگرتن لەم ئازاردانە ئەدوێت.

کیمون و ئەیسافیت پاڵەوان و کاراکتەری ئەم شانۆییەن ،خێزانێکی شیرازەتێك چوون.. هەوڵی بەردەوام بوون ئەدەن، بۆ ئەم مەبەستە پەنا ئەبەنە بەر وێنەگر.

ئەم سێ زنجیــرەیـە هەرسێکیـان لەیـەك تەوەرەدا کۆئـەبنـەوە، ئەو تەوەرەیەش :گیانی ئەم سـەردەمەیە.

ئەوەی شایـانی باسـە ئەم شانـۆگـەریـە لەنـوانـدنی هەرسێ کیژی هونـەرمـەنـدی بەتـوانا فرمێسك مصطفى ،نیگار حسیب علی، میدیا رەئوف ،کە توانیان سەرکەوتوانە، لە یەکەم هەنگاویاندا رووبەرووی تێکستێکی ئاوا گران ببنەوە. هەروەها هەردوو لاوی هونەرمەند شەماڵ عمرو رزگاکریم کە لەوەوپێش چەند جار بەسەرکوتویی بینیومانن.

# دواوشە

## ئەرکێکی پیرۆز

لەدانیشتنێکدا لەگەڵ برایەکی نووسەردا ، باسي مەسەلەیەکی کرد، لەراستیدا شایانی ئەوەیە هەڵوێستەیەکی لاوە بکەین و، بیخەینە بەرچاوی ئەوانەی کەپەیوەندیان پێوە هەیە. . . مەسەلەکە پەیوەندی بەلەناوبردنی پەڕەو فایلی کۆنی دەزگا گشتی یەکانەوە هەیە، کە لەناویاندا لەوانەیە هەندێ بەڵگەنامەو شتی وای تێدا بێ روناکی بخەنە سەر زۆر لایەنی شاراوەی رووداوەکانی ژیانی هەندێ لە نووسەرانمان،کە ئەمەش سوودێکی زۆر گەورە دەگەیەنێتە هەر لێکۆڵینەوەیەك کە لەپاشەرۆژدا دەربارەیان دەکرێ بێگومان ئەو لاپەڕەو کاغەزانە وەکو ئیشێکی رۆتینی لەلایەن دەزگا گشتی یەکانەوە جاروبار لەناو دەبرێن ئیتر بە دڕاندن بێ یان بە سوتاندن .

جا بۆیە داوا لەهەموو دام ودەزگاکانمان کراوە کە بایەخێکی تەواو بەم مەسەلەیە بدەن و ،زۆر لە جێ ی خۆیدا ذەبێ ئەگەر هاتوو هەر دەزگایەك ویستی دۆلابەکانی لە کاغەزی کۆن پاك کاتەوە ئاگاداری دەزگایەکی رۆشنبیری بکاتەوە، بۆئەوەی ئەو بەڵگەنامانە بپشێنکرێن و، ئەوی .گرنگەو بەقیمەت بێ تەسلیمی دەزگایەکی لێپرسراو پسپۆڕ بکرێو، بخرێتە بەردەم نووسەرو ئەدیبانی کورد بۆئەوەی لە لێکۆڵینەوەکانیاندا سوودی لێ ببینن و پەردە لەسەر زۆر لایەنی شارەوەی ژیانی کۆمەڵایەتی و گوزەران و پەیوەندی یەکانیان و بەرهەمەکانیان هەڵبدەنەوە.

هەروەها ئەم مەسەلەیە بۆ ئەو لایەشمان دەبا کەپێشنیار بۆ کۆمەڵەو دەستە رۆشنبیری و هونەری یەکانی کورد بکەین ئەرشیفێکی ڕێك وپێك بۆ چالاکی یەکانیان چاپ بکەن، بەمەرجێ هەموو زانیاری یەکی پێویستیان تیابێ ،خۆ ئەگەر پێشیان چاپ نەکرێ ئەوا هەر ئەرشیفەکە خۆی ڕێکخەن شتێکی چاکەو سوودی دەبێ.

پاراستنی ئەو بەڵگەنامەو زانیاریانە ئەرکێکی شارستانی و نیشتمانی پیرۆزەو ،میللەتانی تر رێوشوێن و یاسای دیاری کراویان بۆ جێ بەجێ کردنی ئەم مەبەستە داناوە. هەرچۆنێ بێ مەسەلەکە پەیوەندی بەرادەی هۆشیاریشەوە هەیە، لەو بڕوایەداین کە خەڵکەکەی ئێمەش لەسایەی ئەو بارە رۆشنبیری یە پێشکەوتوو وگەشەسەندووی ئەم سەردەمەی وڵاتەکەماندا، گەیشتۆتە ئەو رادەیەی کە هەموو لایەك ئاگاداری ئەم مەسەلەیە بن و نەهێڵن ،هەندێ لەو گەنجینەیەی کە لەتۆی فایلە کۆنەکانماندا ماونەتەوە تیا بچن.

عبدالوهاب تاڵەبانی

بەیان
مجلة ادبية شهرية
تصدر عن دار الثقافة والنشر الكردية
وزارة الثقافة والاعلام
بغداد



رئيس مجلس الادارة ورئيس التحرير
مصلح مصطفى الجلالى





**BAYAN**

Litrary Monthly Magazine
Ministry of Culture and Information
Issued by: The Kurdish House for Cultuer and Publishing
Baghdad - Iraq



EDITOR IN CHIEF

**MUSLEH MUSTAFA JALALY**



نرخى (200) فلسه

دار الحرية للطباعة - بغداد